# نەوژین

ژمارە (١) پێنجشەممە ٢٠١٦/١٢/٢٢

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی ئەمریکی NED لەگەرمیان دەریدەکات.




سەربارى ڕێگرییەکان ژمارەی کچانی وەرزشکاری گەرمیان رو لەزیادبونە

""" 11

# لەفەرمانگەکانی گەرمیان ژنان بەهۆی رەگەزیانەوە لەپۆست بێبەش دەکرێن و گوێ لەراوبۆچونیان ناگیرێت

**نەوژین**

**بەپێی راپرسییەکی پەیمانگای کوردیی بۆ هەڵبژاردن، ژنانی فەرمانبەر لە گەرمیان پێیانوایە لەبەر لایەنی رەگەزی جیاکارییان بەرامبەر دەکرێت و راوبۆچونەکانیان بەهەند وەرناگیرێت.**

ئەو راپرسیە کە لەنێوان ژنانی فەرمانبەردا لە سنوری گەرمیان لەلایەن پەیمانگای کوردی بۆ هەڵبژاردن (KIE) ئەنجامدراوەو ١٥٠ فەرمانبەری ژنی گرتوەتەوە، چەند پرسیارێکیان روبەروکراوەتەوە.

بەپێی دەرەنجامی راپرسییەکە، زۆرینەی ژنانی بەشداری راپرسیەکە کەرێژەکەیان (٣٨٪)ە، دەڵێن لەبەر لایەنی رەگەزیی، جیاکارییان لەبەرامبەردا دەکرێت و لەپۆست و ئیمتیاز بێبەش دەکرێن، (٢٩٪) دەڵێن جیاکاریان لەبەرامبەردا ناکرێت و (٢٩٪)ی دیکەش پێیانوایە ئاستی جیاکاری و بێبەشکردنەکە مام ناوەندیە.



چەند ژنە فەرمانبەرێک لەکاتی کاردا

لە پرسیارێکی دیکەدا، رای ژنانی فەرمانبەری گەرمیان وەرگیراوە لەبارەی ئەوەی:"تاچەند گوێ لە راوبۆچونەکانیان دەگیرێت؟" لەبەرامبەردا، (٣٩٪)ی بەشدارانی راپرسیەکە بەوە وەڵامیان داوەتەوە کە گوێ لە راوبۆچونەکانیان ناگیرێت، (٢٦٪)ی گوێگرتن لە بۆچونەکانیان بە مامناوەند وەسف دەکەن.

لەلایەکی دیکەوە، راپرسیەکە ئەوەی دەرخستوە کە ژنانی فەرمانبەر پێیانوایە ئاستی پێدانی دەرفەت بە ژنانی دەڤەرەکە بۆ کارکردن لە فەرمانگەکاندا باشە بەرێژەی (٤٢٪)، (٢٩٪) پێیانوایە مام ناوەندەو (١٥٪) پێیانوایە زۆرباشە.

---

# لەکەمپێکی ئاوارەکانی گەرمیان بازرگانی بە منالانی کچەوە دەکرێت

**نەوژین**

**پاش ئەوەی دو حاڵەتی بەکارهێنانی کچان بۆ لەشفرۆشی لە کەمپێکی ئاوارەکانی گەرمیان ئاشکراکرا، دەرکەوتوە ئەو دو کچە منالّ بون و تەمەنی یاساییان پڕ نەکردبوەوە، خێزانی دو کچەکەش نێردراونەتەوە شوێنی ئەسڵی نیشتەجێبونیان.**



خەبات رەشید، بەڕێوەبەری نوسینگەی مافی مرۆڤی گەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: "لە رێگەی ئیدارەی گەرمیانەوە نوسراوێکمان بۆهات ئاگادارکراینەوە کە دو حاڵەتی بازرگانیکردن بە ئافرەتانەوە لە کەمپەکانی سنوری گەرمیان هەیە کە بەکارهێنراون بۆ لەشفرۆشی، دوای بەدواداچونمان راستی زانیاریەکانمان بۆ دەرکەوت".

وتیشی: "حاڵەتەکە بەکارهێنانی دو کچ بوە لە دو خێزانی جیا، لەلایەن کەسوکاریانەوە بۆ کاری لەشفرۆشی لە دەرەوەی کەمپەکە، ئەو کچانەش تەمەنیان خوار ١٨ ساڵ بوە".

ئاماژەی بەوەشدا :"پاش لێکۆڵینەوەو بەدواداچون و گەشتنە راستیی روداوەکە، دواتر هەردو خێزانەکە کە خەڵکی ناوەڕاستی عێراقن، گەڕێنرانەوە شوێنی خۆیان و لەکەمپەکە نەهێڵرانەوە".

ئاشکراشیکرد وەکو مافی مرۆڤی گەرمیان، داوایانکردوە لەکەمپی ئاوارەکاندا نوێنەر و بنکەیان هەبێت، بۆئەوەی لەنزیکەوە ئاگاداری دۆسیەو روداو و حاڵەتەکان بن و زوتر بەدەمیانەوە بچن.



# ژنان بەرەو رابەرایەتیکردنی کایەی رۆشنبیریی لەگەرمیان هەنگاودەنێن

**نەوژین**

**تەنها لەماوەی ٢ ساڵدا ٣ گروپی رۆشنبیریی ژنان لەگەرمیان دامەزراون کە دەیان چالاکییان ئەنجامداوە، سەرپەرشتیاری یەکێک لەو گروپانەش باس لەوەدەکات ژنان بۆ ئەوە دەچن رابەرایەتی کایەی رۆشنبیریی لە ناوچەکەدا بکەن.**

بەپێی بەدواداچونێکی (نەوژین)، لەماوەی ساڵانی ٢٠١٥-٢٠١٦، ٣ گروپی رۆشنبیریی تایبەتمەند بە کچان و ژنان لە سنوری گەرمیان دامەزراون، کەبریتیین لە: (گروپی مەستورە، گروپی سۆفیا و گروپی کچانی پێشەنگ).

ئەم گروپانە لەماوەی ئەم دوساڵەدا و سەرباری قەیرانی دارایی، دەیان چالاکی رۆشنبیریی جیاوازیان ئەنجامداوە، تەنها یەکێک لەو گروپانە کە (مەستورە)یە، لەم دوساڵەدا، زیاتر لە ٤٠ چالاکیی رۆشنبیریی ئەنجامداوە.

لایخۆشیەوە و لەمیانەی وتارێکدا کە لە لاپەڕە (٩)ی ئەم ژمارەیەی (نەوژین) دا بڵاوکراوەتەوە، (ژینۆ عەلی)، سەرپەرشتیاری گروپی پێشەنگ، ئاماژەی بەوەکردوە کە ژنانی گەرمیان بەرەو ئەوەدەچن رابەرایەتی کایەی رۆشنبیریی بکەن لە گەرمیان دا.

ژنانی گەرمیان لەکەرتی پۆلیس دا، تێپەڕاندنی ئاستەنگ و شکاندنی بەربەستەکان

""" 2



کارکردنی ژنێک لەپیشەیەکی "پیاوانە"... ئامینە، تاقە ژنە بەقاڵەکەی کفری

""" 8




نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب... نەخۆشی زۆر و پزیشکی کەم

""" 10

# ژنانی بێ لانە لە کەلار، لەسەر شەقام و شوێنە گشتیەکان ڕۆژ دەکەنەوە

■ نەوژین- مەریوان سەلمە

**ماوەی مانگێکە چەند ژنێک لە بازارو گۆرستانەکانی شاری کەلاردا دەژین و تا ئێستاش هیچ لایەنێک ئەو حالەتانەی چارەسەر نەکردووە.**

بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان لەگەرمیان، دەڵێت: "یاسای بەرەنگابونەوەی توندوتیژی ئەو حاڵەتانە ناگرێتەوە و هیچ پەیوەندی بە ئێمەوە نییە"، بەڕێوەبەری نوسینگەی مافی مرۆڤیش لە گەرمیان دەڵێت: "با ڕێکخراو و بەڕێوەبەرایەتییەکانی ژنان کۆڕ و سیمینار نەگێڕن بێن کیشەی ژنەکان چارەسەر بکەن".

لەمیعە محەمەد، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان لەگەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: "ئاگاداری کیشەی ئەو ژنانەین بەڵام پەیوەندی بە ئێمەوە نییە و یاسای بەرەنگابونەوەی توندوتیژی ئەو حاڵەتانە ناگرێتەوە".

وتیشی: "ئەو حاڵەتانە پەیوەندی بە نوسینگەی مافی مرۆڤ لە گەرمیان و کارو کاروباری کۆمەڵایەتیەوە هەیە کە دەبێت مالێک بۆ ئەو ژنانە دابین بکەن".

هاوکات خەبات ڕەشید، بەڕێوەبەری نوسینگەی مافی مرۆڤ لە گەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: "وەکو مافی مرۆڤ هەمووشتەکان لەسەر ئێمە نییەو نازانم بۆ ڕێکخراوەکانی ژنان خۆیان لەم بابەتە نادەن؟"

**"داوامان کردوە بۆ ئەوەی کێشەکەمان بۆ چارەسەر بکەن"**

وتیشی: "با ڕێکخراوەکانی ژنان بایکۆتی ٢٥ نۆڤەمبەر بکەن و کۆڕ و سیمینار نەگێڕن تاوەکو کێشەی ئەم ژنانە بە فعلی چارەسەر دەکەن".

بەڕێوەبەری نوسینگەی مافی مرۆڤ ئەوەشی خستەروو ئەوان کاریان پێدەکرێت، بەڵام چاوەڕێی ڕێکخراوەکانی ژنانن تاوەکو بزانن هەڵوێستیان چییە بەرامبەر ئەو ژنانە.

لە ناو شاری کەلاردا تا ئیستا سێ ژن لە دەرەوەی ماڵی خۆیان دەژین و یەکێک لەو ژنانەش شەوانە لە ناو گۆڕستانی کەلاردا دەخەوێت دوو ئافرەتەکەی تریش یەکێکیان لە پارکێکی گشتی دەمێنێتەوەو ئەویتریشیان توشی نەخۆشی دەرونی بووە و لە کۆلان و بازاری شاری کەلاردا دەسوڕێتەوە.



ژنێکی بێلانە لە ناو گۆڕستانێکدا

بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی گەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: ڕەزامەندی وەزیرمان وەرگرتوە بۆ ئەوەی بخرێنە شەلتەری مالی دالدەدانی ئافرەتان لە سلێمانی چونکە "لە شەلتەرەکەی خۆمان تەنها بۆ سێ ڕۆژ دەتوانن بمێننەوە".

دەرون عومەر، وتیشی: "هێشتا ئەو سێ حالەتە بەتەواوەتی چارەسەرنەکراوە و پێویستی بە فەرمانی داواکاری گشتییە بۆ ئەوەی ئەو سێ ژنە بگوازرێنەوە بۆ شەڵتەرەکانی سلێمانی".

دەرون وتیشی: "هەرچەندە ئامادەکاریمان کردووە بۆ ئەوەی لە شەڵتەر دابنرێن، بەڵام لە ڕووی یاساییەوە ئەگەر بڕیارێکی داواکاری گشتی گەرمیانمان پێ نەبێت ناتوانین بیانگوازینەوە".

هەرچەندە لە کەلاردا ئەم سێ حالەتە نامۆیە و تا ئێستا نەبووە بە دیاردە، بەڵام ئەگەری پەرەسەندنی لە ئارادایە. دۆخی ئەو ژنانەش تا ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم ڕاپۆرتە کە مانگێکی پێچوە، وەکو خۆیەتی و بە چارەسەر نەکراوی ماوەتەوە!

---

# ژنانی گەرمیان لەکەرتی پۆلیس دا، تێپەڕاندنی ئاستەنگ و شکاندنی بەربەستەکان




ژنە پۆلیسێکی عێراقی

■ نەوژین- پەیام جەمال

**کاتێک (ژیان) دەستی بەکارکردن لەم پیشەیەدا کرد، بۆ زۆر کەس مایەی سەرسوڕمان بو، کە چۆن ژنێک دەبێتە پۆلیس؟ ئایا ئەم پیشەیە کە لەناو کۆمەڵگادا وەکو کارێکی تەواو نێرانە ناسراوە، ژنێک چۆن دەتوانێت تیایدا سەرکەوتو بێت؟**

ئەم قسانەو ئەم هەمو گومانەی کە کراون و دەکرێن بۆ ئەوەی ژنان لەم بوارەدا سەرناکەون، (ژیان)یان سارد نەکردەوە، بەڵکو ئەو پێداگیرانە درێژەی بەکارەکەی داو ئەمساڵ ١١ ساڵە لەو پیشەیەدا دەستبەکار بوە.

چیرۆکی (ژیان)، چیرۆکی توێژێکی دیارییکراون لە ژنانی کارکەری گەرمیان، کە لە بری کارکردن لە پیشە مەدەنیەکان، ئەمان لە کەرتی سەربازیی و بەتایبەتی لە ریزەکانی پۆلیس دا دەستبەکار بون.

ژمارەی ئەو ژنانەی لە کەرتی ئەمنی دا کاردەکەن لەگەرمیان زۆر کەمن، هەر ئەمەش وایکردوە ئامارێکی ورد لەبارەی ژمارەیانەوە بەردەست نەبێت، بەڵام وەکو تێبینی کراوە، لە بەشێک بۆ بەشێک بەشداریی ژنان لەم کەرتەدا جیاوازە.

ژیان ڕەشید، کارمەندی پۆلیسە لە پاسەپۆرتی گەرمیان. دەڵێت: "یەکەم ئافرەت بووم ئەو کارە بکەم لە گەرمیاندا، من ڕێچکەکەم شکاند و هیچ کات کەس توانجی لێنەداوم".

ژیان ئاماژەی بەو ئاسودەییەدا کە لە پیشەکەیەوە بەدەستی هێناوە "من زۆر ئاسودەم کە دێم بۆ دەوام، ئەوەش خۆشحاڵترم دەکات ئەوەیە خەڵکی کارەکانی منیان پێباشە و بەدڵیانبوە".

خەیاڵ ڕەزا، ژنە پۆلیسێکی دیکەیە، پلەکەی پۆلیسی پیادەی دوە لە بنکەی پۆلیسی زانکۆ.

خەیاڵ دەڵێت: "من لە کارەکەی خۆم ڕازیم، وەکو پیاوەکان کاردەکەم و هیچ جیاوازییەکمان نییە".

**"خۆشحاڵم کە خەڵکی کارەکانی منیان پێباشە"**

هاوشێوەی ژیان، خەیاڵ-یش زۆر ئاسودە بو بەکارەکەی "کارەکەم خۆشدەوێت، لە شوێنەکان کە دەڵێم پۆلیسم زۆر ڕێزم دەگیرێت".

بەوپێیەی لەتێڕوانینی کۆمەڵگادا پیشەی پۆلیسی وەکو پیشەیەکی نێرانە وێناکراوە، بۆیە چونە نێو ئەم بوارە بۆ ڕەگەزی مێ نەک ئاسان، بەڵکو سەخت و هەندێکجاریش مایەی قبوڵکردن نییە.

ژیان سەرەتاکانی دەستپێکردنی لەم پیشەیەدا دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "سەرەتا کە دەستم پێکرد خەڵک دەیان وت ئەم کارە بۆ تۆ نابێت، بەڵام بە پاڵپشتی خێزانەکەم من ڕێچکەکەم شکاند و تائیستاش هیچ کێشەیەکی ئەوتۆم نەبوە".

خەیاڵ-یش ئاماژە بەوەدەکات کە ئەگەرچی خەڵکی بەشێوەیەکی تایبەت سەیری ئەم پیشەیە دەکەن، بەڵام ئەو کە دەستی بەکار کردوە، روبەروی هیچ کێشەیەک نەبوەتەوەو بگرە دەستخۆشیشی لێکراوەو لەلایەن خانەوادەکەیشیەوە پشتیوانیەکی زۆر کراوە.

لەتێڕوانینی کۆمەڵگادا، زۆرجار بۆ ئەوەی ڕێگریی لە ژنان بکرێن بۆ تێکەڵ بون بە هەر پیشەو کارێک، پاساویی ئاینی دەهێنرێتەوە، بەوەی ئاین ڕێگە بەو کارە نادات یاخود دورتر دەڕۆن و بە "حەرام"هەژماری دەکەن. بەڵام ئایا تێڕوانینی ڕاستیی ئاینی ئیسلام لەمبارەوە چییە؟

د.عومەر محەمەد کەریم، کە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا لە شەریعەت، لەوبارەوە بە (نەوژین)ی وت: "خوای گەورە فەرمویەتی: (وقل ڕعملوا ...) کە مەبەستی ئەوەیە کاربکەن و خواو پێغەمبەرەکەی کارەکانتان دەبینن و هەڵیدەسەنگێنن، ئەم ئایەتەش گشتییەو پیا و ژنیش دەگرێتەوە".

ئەو زانا ئاینییە، دەشڵێت: "گەرچی ئیسلام ماڵەوە بە گۆڕەپانی چالاکییەکانی ئافرەتان دەزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارکردن بۆ ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ مافە، بگرە لە دو حاڵەتیشدا دەبێتە ئەرک و واجب، ئەویش ئەو کارانەی کە بە غەیری ئافرەت جێبەجێ نابن، یاخود ئەگەر ئافرەت کەسی نەبو بژێوی بۆ پەیدا بکات".

سەربارى ئەوەی ژمارەیەک ژن لەگەرمیان تێکەڵ بەم بوارە بون و لە ریزەکانی پۆلیس دا کاردەکەن، بەڵام هەتائێستاش زۆرینەی ژنان بەهۆی قسەوقسەڵۆک و تێڕوانینی کۆمەڵگا، خۆیان لە قەرەی ئەم پیشە نادەن.

خەیاڵ، پێیوابو ژنان نابێت هەمو کات و بۆهەمو شتێک گوێ بەقسەی دەوروبەر بدەن. وتی: "لەسەرەتای ئەم کارانە خەڵک قسە هەر دەکات، بەڵام دەبێت متمانە لەناو خێزانەکەتدا دروست بکەیت و ئیشەکەت بە باشیی بکەیت و بونی خۆت بسەلمێنی".

ژیان-یش بەپێداگیرییەوە وتی: "پێویستە کچان هەر بەهرەیەکیان هەبوو کۆتەکان بشکێنن و هەوڵ بدەن و بۆ هەموانی بسەلمێنن کە ئافرەتیش ئەتوانێت وەکو پیاو بەبێ کەموکورتی کاربکات".

# ئەو ژنانەی داوای جیابونەوە دەکەن لەنێوان بەرداشی یاسا و کۆمەڵگەدان



■ **نەوژین — سازان مستەفا**

**ئەگەرچی زیاتر لە چوار ساڵە هاوسەرگیریی کردوەو خاوەنی سێ منداڵە، بەڵام (ژیان) لەئێستادا داوای جیابونەوە لە مێردەکەی دەکات و کەیسەکەی خستوەتە لای مافی مرۆڤی گەرمیان بۆ ئەوەی هاوکاریی بکەن. هۆکاری ئەم داوایەی ژیان، ئەوەیە کە مێردەکەی ژنی دیکەی بەسەردا هێناوەو هەقی ئەم بەپێی پێویست نادات، بۆیە ئەمیش دەیەوێت لێی جیاببێتەوە.**

بەڵام جیابونەوە بۆ ئەم ژنە کارێکی هەروا ئاسان نیە، چونکە بەوپێیەی ئەم ژنە، هەربۆیە کەوتوەتە نێو هەردو بەرداشی یاسا و کۆمەڵگەوە، لەلایەک یاسا ناتوانێت مافی بەتەواوی بۆ وەرگرێت، لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵگاش بەچاوێکی گومانەوە سەیری دەکات.
ئەم حاڵەی کەبەسەر (ژیان) دا هاتوە، بەسەر زۆربەی ئەو ژنانەدا هاتوە یان دێت، کە دەیانەوێت لە هاوسەرەکانیان جیا ببنەوە، بەوپێیەی لە یاسادا ئەو بوارانەی کە ژن دەتوانێت بەهۆیەوە لەمێردەکەی جیا بێتەوە، کەمترە لەوەی پیاوان دەتوانن بەهۆیەوە لە ژنەکانیان جیا ببنەوە، هەروەک ئەو ماف و شایستانەی کە ژنان دەیانەوێت، بەهۆی داواکردنی جیابونەوەوە لەدەستی دەدەن.
ژیان، ئەو ژنەی کە دەیەوێت لە هاوسەرەکەی جیابێتەوە، سەرەتای کێشەی لەگەڵ هاوسەرەکەی بەمشێوەیە بۆ (نەوژین) گێڕایەوە: "تا دو ساڵ ژیانی هاوسەرگیریم خوش ئارام بو، بەڵام پاش ئەو دو ساڵە هاوسەرەکەم بەردەوام خەریکی پەیوەندی بو لە گەڵ کچێک، هەمو رۆژێک پەیوەندیان بەیەکەوە دەکرد و تا ساڵێک هەر بەوشێوەیە بەردەوام بو، دوای ئەوە ماڵی کچەکە بەم پەیوەندیەیان زانی و هەڕەشەیان لە هاوسەرە کەم کرد ئەگەر کچەکەیان مارە نەکات دەیکوژن“.
ئەو ژنە بەحەسرەتەوە ئەو بەشەی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە کە چۆن و بۆ پێدەچێت، هەم ئەو مافەشی کە دەیانەوێت بەپێی پێویست بەدەستی ناهێنن.
(سارە)، ناوی خوازراوی ژنێکی تەمەن ٢٠ ساڵە و دوای (٧) مانگ هاوسەرگیری، داوای جیابونەوە لە مێردەکەی دەکات.
ئەو بەمشێوەیە سەربوردەی خۆی و داواکەی بۆ (نەوژین) دەگێڕێتەوە: ”لەگەڵ مێردەکەم لەرێگای تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوکەوە یەکمان ناسی و بۆ ماوەی ساڵێک بەیەکەوە قسەمان دەکرد، دوای ئەوە هاتە خوازبێنیم و هاوسەرگیریمان کرد. دەسپێکی ژیانمان زۆر ئاسودە بوین، ئەو خوشیە تا مانگێک بەردەوام بو، دوای ئەوە گومانی لێدەکردم هەروەها رەزیلیش بو، هەندێکجاریش هۆی کێشەیەکی بچوکەوە لێیدەدام و وزیندانی دەکردم“.
ئەو ژنە باس لەوەدەکات کە بەمهۆکارانە داوای جیابونەوەی کردوە، بەڵام تائێستا و سەرباری چەند مانگێک، هێشتا کەیسەکەی یەکلایی نەبوەتەوە.
پارێزەر: نەشاد عومەر، جەختی لە درەنگ کەوتنی وادەی یەکلاییکردنەوەی دۆسیەکان کردەوە و هێمای بەوەکرد لەکاتی بەرزکردنەوەی داوا هەتا کۆتای جیابونەوە بکەن لەپیاوەکانیان.
نەشاد عومەر، هۆکارەکانی بۆ (نەوژین) بەمشێوەیە خستە رو: (زیان گەیاندن، ناپاکی هاوسەری ”خیانە زوجیە“، گرێبەستی هاوسەرگیری بێ رازەمەندی داوەر، هێنانی ژنی دوەم، بونی ناکوکی، ئەگەر مێرد زیندانی کرا یا ماڵی بەجێهشت، ئەگەر ژن بۆ ماوەی ٢ ساڵ نەگوازرایەوە، ئەگەر پیاو نەزۆک یان نەخۆش بێت).
وتیشی: ”لە هەرێمی کوردستان یاسایەک هەیە کە پیاو ناتوانێت ژنی دوەم بهێنێت ئەگەر ژنی یەکەم رازی نەبێت، بەڵام چەند مەرجێک هەیە کە رێگە بەپیاوان دەدات ژنی دوەم بێنن، لەوانە: (ژنی یەکەم رازی بێت، ئەگەر ژنی یەکەم توشی نەخوشیەکی درێژخایەن بێت، پیاوەکە بتوانێت دو ژن بەخێو بکات، دەبێت پیاو بەڵێن بدات کە بەیەک چاو سەیری هەردوکیان بکات، ژنی یەکەم لە گرێبەستی مارە بڕیندا ئەوەی دانەنابێ کە ژنی بەسەر نەهێنێت).
سەرباری ئەم هۆکارانەش، بەڵام ژنان خۆیان بە زوڵملێکراو دەزانن لەکاتی داواکردنی جیابونەوە، چونکە دۆسیەکانیان هەم کاتێکی زۆری ئەوەی هاوسەرەکەی روبەروی مەترسیی نەبێتەوە، رازیی بوە ئەو کچە مارە بکات ”زۆر لەوە ترسام مێردەکەم بکوژن، بۆیە رازی بوم بەو هاوسەرگیریە، هاوسەرەکەشم لەو کاتەدا لەبەرامبەر رازی بونی من دا، بە لێنی پێدام کە ٣٥ مسقاڵ زێڕم بۆ بکات و خانوەکەش بکات بە ناومەوە، بەڵام دواتر پەشیمان بوەوە لە بەڵێنەکەی و بەبێ رە زامەندی من لە دادگای خانەقین ژنی دوهەمی مارە بڕی، منیش گەڕامەوە ماڵی باوکم و منداڵەکانم بەجێهێشت“.
لەئێستادا کەیسی (ژیان)، لەلای نوسینگەی مافی مرۆڤی گەرمیانە و ئەوان هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەن.
خەبات رەشید، بەڕێوەبەری نوسینگەکە، بە (نەوژین)ی وت: ”بەگشتی ئێمە لەهەمو ئەو دۆسیەیانە دەکۆڵچینەوە کە پەیوەندی بە مافی مرۆڤەوە هەیە، لەهەمو دۆسیەیەکیشدا دەمانەوێت ماف بۆ ماف خوراوان بگێڕینەوەو هاوکاری ئەو کەسانە بکەین“.
پارێزەرێکیش ئاماژە بۆ ئەوەدەکات، بەپێی یاسای باری کەسێتی لەهەرێم، ئافرەتان تەنها لەسەر چەند هۆکارێکی دیاریکراو دەتوانن لەبەردەم دادگا داوای هاتنی داواکە، ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت بەتایبەتی لە دادگای باری کەسێتی، ئەمەش زۆر جار کێشە بو ژنان دروست دەکات. هەروەها ئەوەشی خستەرو کە زۆر جار بەهۆی نەبونی بەڵگەی تەواو بۆ سەلماندنی هۆکاری جیابونەوەکە، بڕیار بە بەرژوەندی ژنان نادرێت ”بۆیە پێویستە ژنان هۆشیاربن و بزانن چۆن بەڵگە دەخەنەرو“.
راوێژکارێکی حاڵەتەکانی توندوتیژی خێزانی و کۆمەڵایەتی لەگەرمیان، بەپێچەوانەوە وایدەبینێت ئەم درەنگ کەوتنە مەبەست و سودی دیکەی هەیە.
ئەو راوێژکارە کەنەیویست ئاماژە بەناوی بکرێت، بۆ (نەوژین) وتی: ”دادگا پێش بڕیاردان لە جیاکردنەوەی هاوسەرەکان، لەرێگەی ئێمەوە هەوڵی رونکردنەوەی کێشەکان و چارەسەریان دەدات، یان رەخساندنی هەلی تر بۆیان، تاوەکو نەگاتە حاڵەتی تەڵاق و جیابونەوە، چونکە دواجار لێکترازانی خێزان وکومەڵگای بەدوادادێت“.
سەرباری ئەوەی کۆمەڵگا بەچاوێکی جیاواز لەو ژنانە دەڕوانێت کە داوای جیابونەوە دەکەن یان جیا دەبنەوە، ژنان ئەگەرچی لە شەرع و یاساش دا مافیان پێدراوە کە داوای جیابونەوە بکەن، بەڵام وادەبینرێت کە مافەکانیان ناگاتە ئەو ئاستەی کە خۆیان دەیانەوێت و وەکو هی پیاوان نییە، شەرع و یاساش بە لایەنگیرییکردنی پیاو تۆمەتبار دەکرێن.
بەڵام شارەزایەکی ئاینی، جەختدەکاتەوە کەبەپێی شەرع ژنان مافی داوای جیابونەوەیان هەیە.
د.عومەر محەمەد کەریم، خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا لە شەریعەت، وتی: ”پێش هەمو شتێک پێویستە ئامۆژگاری مێردەکە بکرێت بۆ ئەوەی دەستهەڵگرێت لە کارە خراپەکان، ئەگەر تەوبەی نەکرد دەکرێ بەهۆی یاساوە ناچار بکرێت بەدابینکردنی مافەکانی ئافرەتەکە، چونکە پاراستنی خێزان ئەرکێکی گەورەیە، بەڵام ئەگەر سودی نەبو، ئەوا ئافرەتەکە مافی خۆیەتی داوای جیابونەوە بکات و هەمو مافەکانی پارێزراوە لە روی شەرعەوە“.

---

# توندوتیژی دژ بە ژنان لەگەرمیان کەمیکردوە

■ **نەوژین- پەیام لەتیف**

**کەسەردانی بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان لەگەرمیان کرد، لەسەر مێزەکەی دا ژمارەیەک کەیسی جیاوازی توندوتیژی و کێشەی خێزانی دانرابو. ئەوانەی کێشە گەلێک بون کە بەمدواییانە رویان لە دەزگاکەیان کردوە.**

یەکێک لەو دۆسیانەی کە لەم ماوەیەی دواییدا هاتوەتە لای ئەو بەڕێوەبەرایەتییە، دۆسیەی ژنێکە کە لەلایەن مێردەیەکەوە توندوتیژی بەرامبەر کراوە. وتی: ”ئەم ژنە تەمەنی ٢٥ ساڵە، وەکخۆی دەیڵێت هاوسەرەکەی هیچ کات گوێی لێ ناگرێت، بگرە زۆریش لێی دەدات و ئازاری داوە، بۆیە ئەویش سکاڵای لای ئێمە تۆمار کردوە“.
وەک عەقید لەمیعە محەمەد، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان لەگەرمیان بۆیگێڕاینەوە، حاڵەتەکانی هاوشێوەی ئەو ژنە کە رو لە دەزگاکەیان دەکەن، زۆر و جۆراوجۆرن، لە هەمو تەمەن و هەمو ئاست و هەمو بارێکی کۆمەڵایەتی تێدایە، بەڵام رەنگە خاڵی جیاکەرەوەی ئەمساڵ لەچاو ساڵانی تر ئەوەبێت، کەرێژەی ئەو سکاڵایانەی لەلایان تۆمارکراوە، کەمتر بوەتەوە.
عەقید لەمیعە، ئاماژەی بەوەکرد: ”کۆی گشتی ئەو کەسانەی تا مانگی دەی ٢٠١٦ سکاڵایان لە بەڕێوبەرایەتیەکەمان تۆمارکردوە، ٥٣٥ کەس بون، لەو رێژەیەش ٣٧٨ کەسیان ئافرەت بون“، لە ئاماژەیەکدا بۆ ئەوەی تەنها ئافرەتان سکاڵا تۆمار ناکەن، بەڵکو پیاوانیش سکاڵایان دەبێت.
حاڵەتەکانی توندوتیژی، هەر بە تەنیا توندوتیژی جەستەیی و لێدان نییە، بەڵکو هەندێک لەو حاڵەتانە، پێنەدانی ماف، یان سوکایەتی کردن و جنێو پێدانە.
(ز)، پیتی یەکەمی ناوی ژنێکە کە دۆسیەکەی لە بەڕێوبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژییە. پاش ئەوەی ماڵەکەی بەجێدێڵێت، لەلایەن مێردەکەیەوەی سوکایەتی پێکراوەو هەڕەشەی لێکراوە.
وتی: ”بەهۆی ئەوەی لەگەڵ مێردەکەم پێکەوە نەگونجاین منیش ماڵەوەم بەجێ هێشت، بەڵام هاوسەرەکەم بە تەلەفۆن هەرەشەی لێ کردم و جنێو و قسەی نەشیاوی پێ وتم“.
هەر بەپێی ئەو ئامارەی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی گەرمیان، ١٤ لە سکاڵا تۆمارکراوەکانی ئەمساڵ، بەهۆی شەرکردن و ٩ سکاڵاش بەهۆی زەوتکردنی منداڵەوە بوە.
(ح)، ئافرەتێکی تەمەن ٣٥ ساڵە، دەیەوێت لەمێردەکەی جیا بێتەوە و



قەزای کەلار

کێشەی ”زەوتکردنی منالەکانی“ هەیە، بەڵام هێشتا کاری دادگای ماوە.
بۆ (نەوژین) وتی: ”خەمی منداڵەکانمە کە باوکیان دەستی بەسەردا گرتون، منیش سکاڵام لەسەر تۆمار کردوە بۆ ئەوەی منداڵەکانم وەربگرمەوە تا رۆژێک لە دادگا دادوەر کێشەکە یەکلایی دەکاتەوە“.
بەڵام ئایا هەمو کێشە خێزانیەکان هەر لە رێگەی دادگا یەکلایی دەکرێنەوە؟ یاخود ئەو بەڕێوەبەرایەتییە بەشی تایبەتی بۆ ئاشتەوایی و گفتوگۆ هەیە؟
عەقید لەمیعە، ئاماژەی بەوەکرد کە سەنتەری راوێژکارییان لەنێو بەڕێوەبەرایەتییەکەیان دا هەیە.
ئاراز عومەر، توێژەری دەرونی لە سەنتەرەکە، بۆ (نەوژین) وتی: ”قەیرانی دارایی و خراپی باری ئابوری، کاریگەری هەبوە لەسەر کێشەکانی خێزان بەگشتی لەم ساڵدا“.
لەکۆی ٤٧ سکاڵا کە تامانگی ٩ی ئەمساڵ هەواڵەی لیژنەی ئاشتەوایی لە دادگای کەلار کراوە، ٣٠ سکاڵایان چارەسەر کراوە و ١١ سکاڵاش هەواڵەی دادگا کراوە و لەگفتوگۆ و راوێژدان بۆ چارەسەرکردنی، ٦ سکاڵای چارەسەر نەکراوەو کەسەکان ئاشت نەبونەتەوە.
ئاراز عومەر، وتیشی: ”ئێمە هەوڵی چارەسەری کێشەکانمان داوە لەرێگەی گفتوگۆوە و چەندین کێشەمان چارەسەر کردوە بەبی ئەوەی کەسەکان سکاڵا تۆمار بکەن“.
وادیارە ئەم گفتوگۆ و ئاشتەواییانە، رۆڵیان هەبوە لەکەمکردنەوەی توندوتیژی و سکاڵاکانی پەیوەندیدار بەو بوارەوە.
بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژ بە ئافرەتان لەگەرمیان، دەڵێت: ”ئەمساڵ رێژەی سەردانی کردنی ئافرەت و تۆمارکردنی سکاڵا و تۆمارکردنی حاڵەتەکانی توندوتیژی دژ بە ژنان بەگشتی کەمی کردوە، بەڵام رێژەی ئەو ئافرەتانەی لەخوار ١٨ ساڵ بەشودراون و کێشەیان هەبوە، زیادی کردوە“.

# "زۆرینەی ئەو هاوسەرگیرییانەی پێش ١٨ ساڵ ئەنجام دەدرێن کورت خایەن و پڕ کێشەن"

■ نەوژین– زریان محەمەد، جوانە جەلیل

**سارا، لەتەمەنی ١٥ ساڵی دا بەشودراوە، کەمتر لە سێ ساڵ لەگەڵ مێردەکەی بوەو جیابوەتەوە. ئێستا بە تەمەنی ١٩ساڵیەوە، بێوەژنە.**

ئەو دانیشتوی یەکێکە لە لادێکانی دەوروبەری شاری کەلار، بە نیگەرانی و خەمێکی زۆرەوە باس لە ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت : "من بەویستی خۆم و خێزانەکەم لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا هاوسەرگیریم ئەنجام داو، نزیکەی (٣) ساڵ لەگەڵ مێردەکەم ژیام، بەڵام بەهۆی لێک تێنەگەیشتن و کەمی ئاستی وشیاریمان لەسەر پرۆسەکە، بۆ ساڵێکە لە هاوسەرەکەم جیا بومەتەوە".

هاوسەرگیری خوار تەمەنی یاسایی واتە خوار هەژدە ساڵ، یەکێکە لەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی کە ڕۆژانە لە کۆمەڵگادا هەستی پێدەکرێت، ئەگەرچی ئامارێکی دروست لەبارەی ڕێژەی ئەمجۆرە هاوسەرگیرییەوە نیە، بەڵام شارەزایان جەخت لە مەترسیی و خراپیەکانی دەکەنەوە.

بەپێی ستاندارە جیهانیەکانی مافی مرۆڤ، ژن و پیاو دەبێت لە سەروی ١٨ ساڵیەوە هاوسەرگیریی بکەن، ئەمەش بەوهۆیەی لەروی پێکهاتەی جەستەو عەقڵەوە، تانەگەن بەو تەمەنە، تەواو و کامڵ نابن. بەڵام لە کوردستاندا، چ یاسا و چ شەرعیش، ڕێگەی بەوەداوە لەخوار ئەو تەمەنەوە، کچان بەشو بدرێن، بەهەندێک کۆت و بەندەوە.

بە پێی یاسای ژمارە (١٥)ی ساڵی ٢٠٠٨ ی دەرچوی پەرلەمانی کوردستان، هاوسەرگیری خوار تەمەن (١٨) ساڵ ڕێگە پێدراوە، بەڵام مەرجدار کراوە بەبێ بونی ئەو مەرجانەش کە یاسا دیاری کردوە، بە هیچ جۆرێک ڕێگە بەو پرۆسەیە نادرێت.

پارێزەر: ئاریان عوسمان، لە روی یاساییەوە زیاتر رونی دەکاتەوەو دەڵێت: "لە دادگاکانی هەرێمی کوردستاندا ڕێگە پێدراوە کچان لە خوار (١٨)ساڵەوە هاوسەرگیری ئەنجام بدەن ئەمەش لە دو حاڵەتدا:

یەکەم: کچان دەتوانن پێش هەژدە ساڵ هاوسەر گیری ئەنجام بدەن ئەگەر هاتو شازدە ساڵی تەواو کردبێت، دادوەر بۆی هەیە ڕێگە بدات بەو پرۆسەیە، بەڵام بە مەرجێک ئەو کچە باری جەستەی و دەرونی تەواو بێت وشایستە بێت، هەروەها رەزامەندی وەلی ئەمری لەسەر بێت.

دوەم: ئەگەر هاتو چواردە ساڵی تەواو کردبێت و بچێتە ناو پانزە ساڵییەوەو ئەو پەری پێویستی بو، بە هەمان شێوە ڕێگە پێدراوە، بەڵام بە مەرجێک بیسەلمێنێ کەوا توانای جەستەیی هەیە و ئامادەیە بۆ زەواج، ئەمەش لە ڕێگەی لیژنەو پشکنینی پزیشکیەوە دەبێت".

سارا، ئەو ژنەی کە لە خوار تەمەنی ١٨ ساڵیەوە شوی کرد و ئێستا جیابوەتەوە لە هاوسەرەکەی، ئاماژەی بەوەدا کە بە خواستی خۆی و خێزانەکەی ئەو کارەی کردوە، بەڵام دان بەوەدا دەنێت کە هەڵەبون و بەشی پێویست لە ژیان تێنەگەیشتبو بۆ ئەوەی بتوانێت هاوسەرگیریی بکات.

ئەو بێ ئومێدیەکی زۆر لە روخساری دەبینرا و بە گەروی پڕ لە گریانەوە باس لەوە دەکات و دەڵێت :" لە دوای هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریەکەم توشی نائومێدیەکی زۆر بوم و چەندین جار هەوڵی خۆ کوشتنم داوە، تەنانەت هەوڵی خۆسوتاندنیشم داوە".

بە پێچەوانەی ساراوە، دەرون محەمەد-ی تەمەن (١٨) ساڵ، کە ئەویش پێش تەمەنی یاسایی ڕێگەپێدراو شوی کردوە، بە گەشبینییەکی زۆرەوە باس لە ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت: "بۆماوەی دو ساڵە هاوسەرگیریم کردوە و لەگەڵ هاوسەرەکەم ژیانێکی ئاسایی دەژیم".

بەڵام توێژەرێکی کۆمەڵایەتی، دژی ئەو هاوسەرگیرییەیەو بە پرۆسەیەکی شکستخواردو وێنای دەکات.

کارزان فوئاد، وتیشی:" زۆر جار ئەو هاوسەرگیرییانەی پێش هەژدە ساڵ ئەنجام دەدرێن، کورت خایەن و پڕ لە کێشە دەبێت".

مامۆستایەکی ئایینیش، سەرباری جەختکردنەوە لەوەی لەروی شەرعەوە هاوسەرگیریی پێش ١٨ ساڵی ڕێگەپێدراوە، بەڵام پێیباشە کە ئەنجام نەدرێت.

مەلا حەمەئەمین کەلاریی، سەرۆکی لقی گەرمیانی یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی، لەوبارەیەوە دەڵێت: "لە روانگەی ئاینی ئیسلامەوە ڕێگە پێدراوە کچان لە دوای تەمەنی باڵغ بونەوە هاوسەر گیری ئەنجام بدەن واتە (لە تەمەنی دوانزە ساڵی بەسەرەوە)، بەڵام لە ئێستادا باشتر وایە تەمەنی یاسایی تێپەڕاندبێت بۆ ئەو پرۆسەیە".

وتیشی : "بەداخەوە هەندێک لە مامۆستایانی ئاینی لە بەرامبەر وەرگرتنی بڕێکی کەم پارەدا، ئەو کچ و کوڕانە لەیەک مارە دەکەن کەتەمەنی یاساییان تەواو نەکردوە، لە کاتێکدا لە دادگاکانی هەرێم مەرجدار کراوە".

> لەئیسلامدا لە دوای تەمەنی باڵغ بونەوە هاوسەر گیری ڕێگەپێدراوە

ئەگەر چی لە روی یاسای و ئاینیەوە پرۆسەی هاوسەرگیری خوار تەمەنی هەژدەساڵ ڕێگەپێدراوە، بەڵام لە ڕوی کۆمەڵایەتییەوە لێکەوتەو کاریگەری خراپی لێدەکەوێتەوە.

کارزان فوئاد، توێژەری کۆمەڵایەتی، باس لە کاریگەرییەکانی ئەم پرۆسەیە دەکات و دەڵێت: "ئەو هاوسەرگیرییانە لەزۆربەی کات دا سەردەکێشێت بۆ دەرئەنجامی خراپ و مەترسیدار، لەوانەش: (زۆربونی ڕێژەی تەلاق، خۆسوتاندن و خۆکوشتن)، جگە لەوەش زۆر جار منداڵ دەکەوێتە نێوانیانەوە و دەبێتە قوربانی".

وتیشی:" بەوهۆیەوە شیرازەی خێزان و خانەوادەکان تێک دەچێت و سەرئەنجام لێک ترازانی کۆمەڵگای لێدەکەوێتەوە".

به پێی یاسا هاوسەرگیری خوار تەمەن (١٨) ساڵ ڕێگە پێدراوە، بەڵام مەرجدار کراوە

---

# بۆچی ژنان متمانە بە ڕێکخراوەکانی ژنان ناکەن؟

■ نەوژین – شۆخان حەمەساڵەح

**ئەگەرچی ساڵانێکە ڕێکخراوەکانی تایبەت بە ژنان و ئافرەتان لە گەرمیان بونیان هەیەو چالاکیی دەنوێنن، بەڵام هێشتا بەتەواوی لەلایەن ژنانەوە بۆ کێشەو گرفتەکانیان پشتیان پێنابەسترێت، بەشێک لە ژنان گومانیان هەیە لە توانای ڕێکخراوەکان، بەرپرسی ڕێکخراوێکیش هۆکارەکەی بۆ دروستنەبونی متمانە لەنێوان ئەوان و ژنان دا، دەگێڕێتەوە.**

بوشرا محەمەد، خوێندکاری زانکۆ، پێیوایە کە کاری ڕێکخراوەکانی ژنان دو لایەنەیە، لایەنی ئەرێنی و نەرێنی "هەندێکجار ڕێکخراوەکان بون بەشوێنی پاراستنی ئافرەت لە توندوتیژی، بەڵام بەڕای من ئەو ڕێکخراوانە لایەنی نەرێنیان زۆرترە، چونکە ڕۆیشتنی کێشەی خێزانی بۆ ئەو ڕێکخراوانە وا دەکات کە کێشەکە گەورەتر بێتەوەو پیاو رق ئەستور بکات".

دەشڵێت: "پێمباشە هەمیشە کێشەکان لەناو خێزانەکاندا چارەسەربکرێن و ئەمەش باشترە لەوەی کەچارەسەری کێشەکان بخرێنە بەردەستی کەسانێک کەهیچ ئاگایان لە کارو رەفتاری خێزانەکان نیە".

بەڵام چالاکوانێکی ژنان رەدی دەکاتەوە کە ئەوان بەبێ بونی زانیاریی پێویست، تەداخول لەکێشەکان دا بکەن.

ڤیان سابیر، بەرپرسی سەنتەری بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژی مێیەنە لەگەرمیان، بە (نەوژین)ی وت: "هەر کێشەیەک دێتە لای ئێمە گوێ لەهەردو لایەن دەگرین و ئینجا هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەین، ئەو قسەیەش راست نیە و لە نەشارەزاییەوە دەکرێت، چونکە ئێمە خاوەنی کێشەکان کۆدەکەینەوەو هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەیان دەدەین نەک بەپێچەوانەوە".



گردبونەوەیەکی ڕێکخراوەکانی ژنان لەکوردستان

لە دەڤەری گەرمیان ئەو ڕێکخراوانەی کە بواری ژنان وئافرەتان دا کار دەکەن، جگە لە هەندێکیان، ئەوانی دیکە سەر بە حیزبە سیاسییەکانن. بەڕای رۆژنامەنوسێک، ئەم راستیە وادەکات کە کارەکانی ڕێکخراوەکان لەچوارچێوەی بەرنامەو پەیڕەوی حزبەکانیان دەرنەچێت.

شنە محەمەد، بە (نەوژین)ی وت: "هەر ڕێکخراوێک خاوەن ئایدیاو ئایدۆلۆژیای خۆیەتی و لەچوارچێوەی ئەو بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامە دەرناچێت کەحیزبەکەی بۆی دیاریکردوە".

وتیشی: "لەرابردو و ئێستاشدا کارەکانیان لەئاست چاوەڕوانی و پێداویستی ژناندا نەبوە، جگە لەنائومێد کردنیان هیچ ئومێدێکیان پێ نەبەخشیون".

ئەگەر ئەم رۆژنامەنوسە رایوابێت کە کاری ڕێکخراوەکانی ژنان لە ئاست چاوەڕوانی دا نەبوە، ئەوا خوێندکارێکی زانکۆ دورتر دەڕوات و پێیوایە ڕێکخراوەکان کێشەکان گەورەتر دەکەنەوە.

بەبۆچونی (سۆزان فوئاد)، ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان وەکو پێویست نەیانتوانیوە خزمەت بەپرسی ئافرەتان بکەن بەگشتی و بەپێچەوانەوە رۆڵیان هەبوە لە گەورەکردنی کێشەکان و سەرکەوتو نەبون لەهۆشیارکردنەوەی ئافرەتان سەبارەت بەمافەکانیان.

لەبەرامبەر ئەم بۆچونەدا، قەدریە قادر فەتحوڵڵا، لێپرسراوی لقی گەرمیانی یەکگرتوی خوشکان، رایوایە کە مەبەست و ئامانج لەدامەزراندنی ڕێکخراوەکانی ژنان خزمەت کردنە بەژنان و ئافرەتانە، پێشیوایە هەر ڕێکخراوێک لانیکەکەم "توانیویەتی کێشەو گرفتەکانی هاوفکر و لایەنگرانی خۆی چارەسەر بکات".

ئەو باس لەوەشدەکات کە ئەرکی ڕێکخراوەکان لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ژنان لەگەرمیان قورسە و دەسەڵاتی ئەوانیش سنوردارە "کۆتا ڕێگە چارە کە ژنان پەنای بۆ بەرن ڕێکخراوەکانە، دەسەڵاتی ڕێکخراوەکانیش سنوردارە و تەنها لەچوارچێوەی قسەو توێژدایە".

باسلەوەشدەکات کە تائێستا متمانەیەکی تەواو لەنێوان ئافرەتان بەرامبەر بە ڕێکخراوەکانی ژنان دروستنەبوە، بۆ ئەمەش هۆشیاربونەوەی خودی ئافرەتان بەگرنگ دەزانێت.

بەڵام ڤیان سابیر، رایوایە کە نابێت ئەم حوکمە بەسەر هەمو ڕێکخراوەکان بگشتێنرێت، چونکە ڕێکخراوەکان توانیویانە کەیسی زۆر قورس و کێشەی زۆر ئاڵۆز چارەسەر بکەن پێش ئەوەی روداوی نەخوازراوی لێبکەوێتەوە.

ئاماژەی بەوەشکرد: "راستە تێبینی هەیە لەسەر ئەدای ڕێکخراوەکان چونکە زۆرینەیان سەر بەلایەنە سیاسیەکانن، بەڵام ڕێکخراوی وەکو ئێمەش هەن کە سەربەخۆین و چالاکیمان کردوە بۆ خزمەتی ژنان".

> ڕۆیشتنی کێشەی خێزانی بۆ ئەو ڕێکخراوانە پیاو رق ئەستور دەکات.

رەنگە تاکە کێشەی ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان ئەوەنەبێت کە پاشکۆ و گرێدراوی حزبێکن، بەڵکو بەڕای توێژەرێکی دەرونی، یەکێک لەدیارترین کێشەکانیان ئەوەیە کە دەکەونە ژێر کاریگەریی کۆمەڵگاوە.

سەنگەر حەمید، بۆ (نەوژین) وتی: "لەوانەیە لەکۆمەڵگەیەکی پیاوسالاریدا ئەرکی ڕێکخراوەکانی ژنان سەخت بێت چونکە زۆر جار بەبێ ویستی خۆیان ئەو ڕێکخراوانە دەکەونە ژێر کاریگەری رای کۆمەڵگەوە یان زۆرجار ناهەوسەنگی بارودۆخ کێشە لەکارەکانیان دروست دەکات، ئیدی ئەمە وەکو ناکارایی و کەمتەرخەمی ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان پیشان دەدات".

ئەو توێژەرە رایوایە کە "زۆربەی ئەو ڕێکخراوانەی کەلەکاری ڕێکخراوەییدا لەسەر شیکردنەوەی کێشەی ژنان کار دەکەن بیروڕای جیاوازیان هەیە، بەمەش زۆرجار هەوڵەکانیان دەچێتە چوارچێوەی دژی یەکتریەوە".

ئافرەتێک لەکاتی کاردا لەکەرتێکی تایبەتدا

# ئافرەتانی گەرمیان رو لەکەرتی تایبەت دەکەن

■ نەوژین- بەیان حەسەن

**(سروە محەمەد)ی تەمەن (٤٠) ساڵ ڕۆژانە بۆ ماوەی زیاتر لە (٥) کاتژمێر لە یەکێک لە نانەواخانە کوردەوارییەکانی سنوری گەرمیان سەرقاڵی دروست کردنی نانە. وەکخۆی دەڵێت لە نێوان حەز و پەیداکردنی بژێوی ژیاندا ئەو ماوەیە دور لە ماڵ و منداڵەکانی و بەهێز و توانای خۆی، بژێوی خێزانەکەیان پەیدا دەکات.**

ئەگەرچی زۆرینەی ئەو کاسبکار و فرۆشیار و دوکاندار و پیشەوەرانەی کە لە بازاڕەکانی گەرمیان و کوردستان دا هەن لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام لە نێوانیشیاندا بە شێوەی دەگمەن ئافرەت بەدی دەکرێت، هەندێکیان وەکو حەز و خولیا ئەم کارانە دەکەن، هەندێکی تریشیان وەکو سەرچاوەیەک بۆ بژێویی.

سروە، کە ناوی خوازراوی ئەو ژنەیە کە کار لە نانەواخانەیەکی کوردەواریی دا دەکات، دەڵێت: ”لە ماڵەوە حەوت سەر خێزانن کە لە خۆی و مێرد و پێنج منداڵی پێکهاتون کە سەرجەمیان کوڕن و هیچ پیشە و کەسابەتێکیان نیە تەنها ئەوە نەبێت مێردەکەی هەندێک ڕۆژ کرێکاری دەکات، بەڵام زۆرجار کرێکاریشی دەست ناکەوێت“.

ئاماژەی بەوەشکرد لەلایەکەوە وەک حەز و ئارەزویەک ئەم کارە دەکات کە کۆڕ و کۆمەڵگا و دەر و دەشت دەبینێت لەلایەکی تریشەوە یارمەتیدەرێکی سەرەکیە بۆ پەیداکردنی بژێوی ماڵ و منداڵی.

ئەگەرچی داهاتی ڕۆژانەی (سروە) تەنها پێنج هەزار دینارە بەڵام وەک خۆی دەڵێت: ”شوکور بۆ خوای گەورە زۆر زۆر پێی قەناعەتم و ڕۆژانە دەتوانین پێی بژین چونکە ماڵی وا هەیە ئەو داهاتەشیان نیە“.

(سروە) وەک خۆی دەڵێت: ”سەرەتای ئەم کارە بۆ من قورس نەبو چونکە من خۆم پێشتر لە گوند ژیاوم و نانم دروست کردوە بۆیە ئاساییە لام ئەم کارە“، باس لەوەش دەکات ”بونی کۆمەڵێک سەنتەر و ڕێکخراوی تایبەت بە ژنان هیچ کەڵک و سودێکیان نیە تەنها بەناو هەن، چونکە سەردانیان نەکردوین“.

نەریتی کوردەواری وایە کەبەگشتی ئافرەت زۆر ڕێگەی پێنەدرێت بۆ دەرچون و کار و پیشەیەک، بەتایبەت لەکەرتی تایبەت دا، ئەم نەریتەش (سروە) ی لێ بەدەر نەبوە. ئاماژە بەوەدەکات لەسەرەتاوە مێرد و کوڕەکانی پێیان ئاسایی نەبوە کار بکات، بەڵام دواتر قورسی بارودۆخی ژیان وای لێکردون ڕێگەی بدەن.

”کاتێک دەستم کرد بە کار و هاتم بۆ

> بژێوی ژیان وای لێکردم ئەم کارە هەڵبژێرم

ئیش سەرەتا زۆر قورس بو بەلامەوە هەرچەندە خاوەن کار مامەڵەی زۆر باش بو لەگەڵمدا بەڵام لەگەڵ ئەوەش چەند جارێک لەلایەن کڕیارەوە توشی توانج لێدان و قسە و قسەلۆک بوینەتەوە بەڵام ئێمە بۆ کەسابەت هاتوین خۆ ناکرێت وەڵام بدەینەوە ئەگەر وا بکەین ناتوانین بەردەوام بین لە کاسبی“.

ئەمە قسەی (نێرگز) ی تەمەن ٢٨ ساڵە کە لە یەکێک لە مارکێتەکان کاری فرۆشیاری دەکات.

دەڵێت: ”من بۆ خۆم کە ئەم کارەم هەڵبژارد ماڵی باوکم و مێردەکەشم زۆر یارمەتیدەرم بون و هاوکار و هاندەرم بون، من لەلایەک حەز و لەلایەکی تریشەوە بژێوی ژیان وای لێکردم ئەم کارە هەڵبژێرم و زۆریش قەناعەتم پێیەتی“.

لە بەرامبەر ئەو ئافرەت و کچانەی کە خولیای ئیشوکاریان هەیە و کەسوکار و کۆمەڵگا ڕێگریانە، (نێرگز) وتی: ”من پێیان دەڵێم نابێت شەرم بکەن و ئەوانیش ئازادن وەکو پیاوان کە کار و کەسابەتێک کە گونجاو بێت ئەنجامی بدەن و بیکەن“.

وتیشی: ”پێمخۆشە ئافرەتان نەک هەر وەکو فرۆشیارێک لە مۆڵ یان مارکێت یان هەر جێگایەکی تر کار بکەن، بەڵکو بتوانن خۆیان فرۆشگا یان دوکان و مارکێتێک بۆ خۆیان دابنێن“.

چالاکێکی بواری ژنان، ڕایوایە کە روکردنی ژنانی گەرمیان بۆ بواری کاسبی و بازاڕ، دو هۆکار و لایەنی هەیە.

زەینەب ئەرکەوازی، بۆ نەوژین وتی: ”لایەنێکی بۆ دەست ڕەنگینی خۆیان و لایەنێکی تریشی بۆ بژێوی ژیانیانە“.

وتیشی: ”لە ماوەی ٢ ساڵی ڕابردو تاوەکو ئێستاش بەهۆی قەیرانی داراییەوە زیاتر ژنان و منداڵان بونەتەوە قوربانی ئەم دۆخە، بۆیە زیاتر ڕویان لە ئیش و کاسبی کردوە بۆ بژێوی ژیانیان بۆ نمونە درومان ، نان دروستکردن و .. هتد“.

ئەو چالاکوانە، ڕەخنە لە سەنتەر و ڕێکخراوەکانی ژنانیش دەگرێت لەم پرسەداو دەڵێت: ”ڕێکخراوەکان یان سەنتەرەکانی تایبەت بە ژنان کەمترین توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان کردوە لەسەر ئەو ژنانەی کە ئیش و کاسبی

> لایەنێکی بۆ دەست ڕەنگینی و لایەنێکی تریشی بۆ بژێوییە

دەکەن بۆ ئەوەی بەسەریان بکەنەوە لێیان بپرسن یان هاندەر و هاوکاریان بن بۆ ئەوی زیاتر برەو بە ئیشەکانیان بدەن“.

بۆپەرەپێدانی کارەکانی ئەو ژنانەش، زەینەب پێشنیازێک دەکات: ”هەر نەبێت کارێک بکرێت بازاڕێکی تایبەت بە ژنان هەبێت بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانیان، چونکە ئێستا ئێمە دەبینین لە بەغدا و خواروی عێراق بازاڕی تایبەت بە بەرهەمهێنانی کاری دەستی ئافرتان هەیە“.

ئەو دو ژنەی وەکو نمونە بۆ ئەم ڕاپۆرتە دواندمان، جەختیان لە بونی توانج و قسەی خەڵکی کردەوە، کە ئەمەش لێکەوتەی دەرونی زۆری بەسەریانەوە دەبێت.

سەنگەر حەمید، توێژەری کۆمەڵایەتی، بە نەوژین ی وت: ”ئافرەت لەم کۆمەڵگایە کە کارێکی سەربەخۆ دەکات وەکو فرۆشیاری یان پیشە و کاری دەستی یان هەر کارێکی دیکە ڕوبەڕوی توانج و قسەی جۆراوجۆر دەبێتەوە ئەمەش کاریگەری دەرونی زۆر دروست دەکات لای ئافرەتان چونکە ئافرەت هەست و دەرونی ناسکتر و حەساس ترە لە پیاوان بۆیە ئەمەش دەرونییەن کاریگەری دروست دەکات لێیان“.

وتیشی: ”ئەگەر تەماشای وڵاتە پێشکەوتوەکان بکەین دەبینین ئافرەتان شان بەشانی پیاوان کار دەکەن و زۆر ئاساییە بەڵام کۆمەڵگای ئێمە هێشتا ماویەتی بگاتە ئەو کۆمەڵگایە“.

هەرچەندە ئافرەتان لە کاتی کارکردندا هەندێک جار روبەڕوی قسە و توانجی جۆربەجۆر دەبنەوە لەلایەن کڕیار و هەندێک جار لەلایەن کەس و کاریشیانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها بە حاڵەت نەبێت هیچ کات ئەو توندوتیژیانە ناگەیەندرێتە بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژی ژنان.

عەقید لەمیعە محەمەد، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنانی گەرمیان، بۆ نەوژین وتی: ”تەنها حاڵەتێک نەبێت کە ڕوبەڕوییەک بوبو بەرامبەر بە ئافرەتێک کە دوای ئێواران لە عەیادەیەک کاری کردبو، هیچ کەیس و حاڵەتێکی تری توندوتیژی بەرامبەر بە ژنان لە شوێنکارەکانیان نەهاتۆتە لامان“.

# چیرۆکی ئەو ژنە هەشتاساڵێەی لەکەلار فرۆشیاریی دەکات

خاتوو لەمیعە لەکاتی کارکردندا

■ نەوژین – زریان محەمەد، جوانە جەلیل

**خاتو لەمیعە کە پیریی تەنگی پێهەڵچنیوەو ماوەی زیاتر لە (٢٤) ساڵە لەکەلار، بە گەرمای هاوین و سەرمای زستان لە دوکانێکی دو مەتریدا، بە فرۆشتنی جلوبەرگی کۆنەو سابونی رەقی و سمڵ و خەنەو وزمەو بابەتی تری جوانکاریی کوردەواریی، بژێوی ژیانی خۆی و کچە تاقانەکەی دابین دەکات کە خاوەن پێداویستی تایبەتە.**

پورە لەمیعە، لە هەشتاکانی تەمەنیدایە و لەو تەمەنە نائومێدییەدا، بە کۆمەڵێک نەخۆشییەوە،سەر گوزشتەی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە. بەهۆی نەخۆشییەوە ساڵیادی لەدایک بونی خۆی و منداڵەکانی و هاوسەرگیریەکەی و مردنی مێردەکەی بیرنایەتەوە، بۆیە وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانی بەو روداوانە دایەوە کە لە هەرێمی کوردستان رویان داوە لە رابردودا“.

ئەو دەڵێت: ”لە ساڵانی شەستەکاندا هاوسەرگیریم کردوە و لە خێزانێکی ناسراو و دەوڵەمەند بوین، بەڵام لەسەردەمی ڕژێمی بەعسی لە ناوچودا، بە هۆی ئەوەی کە مێردەکەی عەسکەر بوە لە سەر ڕێگای ناحیەی جەلەولا (گولالە) دەکوژرێت و چوار منداڵی هەتیو لە دوای خۆی بە جێدەهێڵێ“.

پورە لەمیعە، بە هەناسەیەکی ساردو بە گەروی پڕ لە گریانەوە باس لە دەستپێکردنی مەینەت و نەهامەتییەکانی خۆی لە دوای کوژرانی هاوسەرەکەی دەکات و دەڵێت: ”بەهۆی شاڵاوی ئەنفال بە دەستی رژێمی بەعسی بەدناو، هەرچیمان هەبو لە دەستمان دا وەک ماڵ و موڵک و زەویوزار و ئاژەڵ ... هتد، تەنها خۆم و چوار منداڵە بێ نازەکەم ماینەوە کە سێ کوڕ و کچێکی تاقانەیە“.

ئەو باسلەوەش دەکات ”لە دوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ گەڕانەوەیان لە وڵاتی ئێران، دەگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی بەتاڵ و خاڵی لە هەمو پێداویستیەکانی ناو ماڵ، ئیتر لێرەوە خەم و ئازارەکانی پورە لەمیعە دەست پێدەکات“.

> بەهۆی ئەنفال هەرچیمان هەبو لەدەستمان دا

ئەو بۆ کۆکردنەوەی خێزانەکەی و دروست کردنی هێلانەیەکی گەرم و ژیانێکی ئاسودە بۆ منداڵەکانی دەست بە کارکردن دەکات لە ساڵی ١٩٩٢ وە، تاوەکو ئێستاش بەردەوامە لە کارکردن بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانی خۆی و منداڵەکانی.

وتیشی: ”لە دوای گەڕانەوەمان بۆ کوردستان خێزانم بۆ هەرسێ کوڕەکەم پێکهێناوەو ئێستا ئەوان لە ژیانی خۆیان دەژین، ئەگەرچی گوزەران و بارودۆخی ئەوان لە ژیانی خۆم کەمتر نییە“.

پورە لەمیعە، کە ناو بەناو دەستە ماندو و زبرەکانی بە ناوچاوانیدا دەهێناو سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکردو ئاهێکی قوڵی دەکێشاو دوبارە دەستی بە قسەکردن دەکردەوە، ئەو بەهۆی ئەوەی کە کچەتاقانەکەی نەخۆشی دەرونیو جەستەیی لەگەڵدایە، نەیتوانیوە لەگەڵ کوڕەکانی لە ماڵێکدا ژیان بەسەر بەرن، بۆیە ئێستا لەگەڵ کچەکەی پێکەوە سەختی ژیانیان دەگوزەرێنن.

سەرەڕای چونە سەرەوەی تەمەنی و کەم توانایی لە کارکردن، پورە لەمیعە، هیچ موچەیەکی نیە لە ئێستادا، هەرچەندە ئەو موچەی بێوەژنانەی هەبوە پێشتر وەریگرتوە، بەڵام لە ئێستادا بڕاوە. ئەو دوکانەشی کە کاری تێدا دەکات هی خۆی نییەو لەلایەن خێر خوازێکەوە بۆی دابین کراوە.

سەرەڕای هەمو ئەو بەربەست و ئاستەنگانەی لەبەردەم ئەو ژنانەی کە لەدەرەوە کاردەکەن، پورە لەمیعەش بەدەر نیە لەو ئافرەتانە، وەکخۆی دەڵێت: ”لەپێناو منداڵەکانی رچە شکێنی کردوەو گەنجێتی و ژیانی خۆی لەو پێناوەدا بەرێکردوە“.

## خەونەکانیان بۆ (نەوژین) دەگێڕنەوە

# حاڵەتەکانی بونی منالانی ئیشکەر لەگەرمیان رو لەزیادبونە



مندالێک لەکاتی کارکردندا

■ نەوژین- کوێستان حەسەن

**ئەگەرچی تەمەنی تەنها ١٠ ساڵە، بەڵام عومەر باست، هەمو بەیانیەکی زو، لەماڵ دەردەچێت بۆسەر کار. کاری ئەو بریتییە لە فرۆشتنی کلینکس لەسەر شەقامەکانی ناوشاری کەلار.**

عومەر، کەبە نەتەوە عەرەبە، لەگەڵ خێزانەکەیداو بەمدوایەو پاش هاتنی داعش و خراپبونی رەوشی ئەمنیی، لە شارەبانەوە رویان لە کەلار کردوە، ئێستا لەخانویەکی کرێدان و لەرەوشێکی خراپی ژیان دان.

ئەو یەکێکە لەو دەیان منالەی کە لەم دواییانەدا بونیان لەسەر شەقام و ناوبازاڕ و شوێنی کارکردن دا، زۆر بوە. کارکردنی منالان، واتا ئەوانەی خوار تەمەنی ١٨ ساڵن، بەپێی جاڕنامە جیهانیەکانی مافی مرۆڤ و یاسای کاری عێراقی، رێگەپێنەدراوە، بەڵام ئەوەی لەگەرمیان و بەدیارییکراوی لەکەلار تێبینی دەکرێت، کارکردنی منالان رۆژ بەرۆژ رو لەزیاد بونە، بەتیابەتی کارکردنی منال لەسەر شەقامەکان.

بەرێوبەری مافی مرۆڤی گەرمیانیش دەڵێت:"لەگەڵ هاتنی ئاوارەکان ئەم دیاردەیە سەری هەڵداوە".

یوسف سەلاح، یەکێکی ترە لەو منالانەی لەسەر یەکێک لەشەقامەکانی شاری کەلار کلینسک دەفرۆشێت. ئەو ئەگەرچی تەمەنی ١٤ساڵە، بەلام واماوەی ٥ ساڵە کار دەکات.

هاوشێوەی عومەر، ئەویش لەنەتەوەی عەرەبە و خەڵکی قەزای شارەبانە و ئاوارەی کەلار بونە.

یوسف، باس لەوەدەکات بەهۆی دەستکورتیەوە، ناچار بەکارکردن بوەو تەنانەت دەستبەرداری خوێندنیش بوە "وازم لەخوێندن هێناوە بەهۆی دەست کورتی و نەداریەوە بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی خێزانەکەم و دەبێت لەبەیانی تا ئێوارە کلینیسک بفرۆشم".

**هەژاری وایلێکردوم گوێ بەخوێندنی کوڕەکەم نەدەم**

**بەئارەزوی خۆم خۆم کاردەکەم و یارمەتی ماڵەوە دەدەم**

**حەز دەکەم خوێندن تەواو بکەم و ببم بەمامۆستا**

هەرتەنها منالانی ئاوارە نین کە لە بازاڕەکانی گەرمیان دا کاردەکەن، بەڵکو منالانی نیشتەجێی سنورەکەش زۆرن کە بۆ بژێویی خێزانەکانیان ناچار بون یان ناچارکراون کار بکەن.

محەمەد سەرکەوت، نمونەی یەکێکە لەو منالانە. ئەو تەمەنی ١٢ساڵەو خەڵکی کەلارە و لەناو بازاڕی شارەکەی میوە دەفرۆشێ.

محەمەد ئەگەرچی کاردەکات، بەڵام هاوکات دەشخوێنێت و وازی لە خوێندن نەهێناوە. بۆ (نەوژین) وتی: "باری ئابوریمان مامناوەندیە و بەئارەزوی خۆم کاردەکەم و یارمەتی ماڵەوە دەدەم و رۆژی ١٢ هەزارم دەست دەکەوێت لەم کارەم".

وەک خۆی ئاماژەی بۆدەکات، کارەکەی قورس نییە و خۆی حەز بەکارکردن دەکات.

هەرچەندە بەپێی یاسا نابێت منال تا تەمەنی ١٨ساڵی کاربکات، بەڵام زۆرێک لەو منالانەی کە کاردەکەن، لەلایەن خێزانەکانیانەوە ناچار کراون.

باوکی یەکێک لەو منالانەی لەسەر شەقام کاردەکەن، دانی بەوەدا نا کە خۆی منالەکەی بۆ کارکردن ناردوە.

ئەو پیاوە کەناوی لای (نەوژین) پارێزراوە، وتی: "دەستکورتی و نەداریی وای لەمن کردوە کە گوێ بەخوێندنی کوڕەکەم نەدەم، بەڵکو بۆ دابین کردنی بژێوی ژینمان خۆشم بەیانی تا ئێوارە عەرەبانە پاڵ ئەنێم و کوڕەکەشم خەریکی کلینسک فرۆشتنە و بەم شێوەیەش بژێوی ژیانمان هەر قورسە چونکە ئێمە ئاوارە بوینە بەهۆی شەڕەوە".

بەڵام نوسینگەی مافی مرۆڤ لەوبارەوە رایەکی تری هەیە و پێیوایە هەندێک لەو منالانە بەزۆر دەنێردرێن بۆ ئیشکردن و خێزانەکانیان پێویستیان بە کاری ئەوان نیە.

خەبات رەشید، بەرێوەبەری نوسینگەی گەرمیانی مافی مرۆڤ، بۆ (نەوژین) وتی: "ئێمە سەردانی چەند خانەوادەیەکمان کردوە، بۆمان دەرکەوتوە تەنها لایەنی ماددی نییە، چونکە کەسوکاریان توانای کارکردنیان هەیە و دەتوانن ئەو منالانە نەنێرنە سەرشەقامەکان".

ئەو بەرپرسەی مافی مرۆڤ، باسیلەوەکرد ئامارێکی دیاریکراوی منالانی ئیشکەر لەبەردەستدا نییە، لەبەر ئەوەی بەوتەی خۆی ژمارەکە دیاری کراوی نییە و لەگۆڕاندایە، بەڵام وەکخۆی وتی: "ژمارەکە لەگەڵ هاتنی ئاوارەکان دا زیادیکردوە".

خەبات رەشید، وتیشی: "ئەو منالانەی کە کوردن و کار دەکەن لەناو بازاڕدا هیچ کێشەیان دروست نەکردوە، بەڵکو هەندێکیان لەگەڵ باوکیاندا کار دەکەن و زیاتر وەکو فێرکردن لەگەڵ خۆیان دەیان هێنن بۆ کارکردن".

ئەگەرچی زۆرینەی کاتی منالانی ئیشکەر، سەرقاڵی کارو کاسبین و کەمتر دەرفەتی پیادەکردنی ئارەزو و خولیاکانیانن، بەڵام هێشتا لە خەون بۆ داهاتوی خۆیان نەکەوتون.

عومەری ١٠ ساڵان، کە پرسیاری خەونەکانمان لێکرد، بێوەستان وتی: "حەز دەکەم خوێندن تەواو بکەم و ببم بەمامۆستا".

کە هەمان پرسیارمان لە (یوسف)ی هاورێی کرد لەبارەی خەونەکانیەوە، وتی: "کاتێک لە قوتابخانە بوم ئاواتم ئەوە بو ببم بەئەندازیار، بەڵام لەئێستادا تەنها من بوەتە ئەوەی کە بتوانم رۆژانەیەکی باش بەدەست بێنم بۆ یارمەتی دانی خێزانەکەم".

# هەڵکشانی حاڵەتەکانی دەستدرێژیی سێکسی بۆ سەر منداڵان

■ گوڵباخ حەسەن

دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر منداڵان یەکێکە لەو دۆسیانەی لە زۆرێک لە دادگاکان دا تۆمارکراوە، ئەم دۆسیەیە راچڵەکێنترین دۆسیەیە بۆ تاکی کورد بەو پێیەی حاڵەتێکی نامۆیە بە نیسبەت کۆمەڵگای کوردیەوە ، هەرچەندە زۆربوونی ئەو حاڵەتە خەریکە شۆک هێنەریەکەی لەدەست دەدات.

بەشێک لە حاڵەتەکانی دەستدرێژی کردنە سەر منداڵ بە نهێنی هێڵراوەتەوە، ئەمەش پەیوەندی بە داخراوی کۆمەڵگای کوردیەوە هەیە ، ئەم بەنهێنی هێشتنەوەش وایکردووە هەنگاوی ئەوتۆ بە بەرگرتن بەتەشەنە کردنی ئەم حاڵەتە نەگیرێت.

پەروەردەی کۆمەڵایەتی تاکی کورد یان ئەو ژینگە کۆمەڵایەتیەی کە پێی دەوترێت خێزان نەیتوانیوە منداڵێکی هۆشیار و تەندروست پەروەردە بکات بۆ ئەوەی لەبەرانبەر دەستدرێژیەکان بەدەنگ بێت ، بۆیە دواجار ئەو منداڵانەی دەست درێژی دەکرێتە سەریان توشی دەیان گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبن و دواجار چارەسەر کردنی ئەو گرفتانەش ئاسان نابێت.

هەرچەندە دۆسیەکانی دەستدرێژی تارادەیەک دۆسیەی نهێنین و ئامار کردنیان ئەستەمە ، بەڵام بێگومان رێژەکە لە ئاستێکی بەرزدایە و زۆربەی دۆسیەکان بە نهێنی ماونەتەوە بەتایبەت مەسەلەی دەست درێژی کردنە سەر منداڵان.

لەچەند هەفتەی رابردوودا دەستدرێژی کردنە سەر کورێکی دە ساڵان لەهەولێر لەلایەن خاوەن کارەکەیەوە یان دەستدرێژی کردنە سەر منداڵە ساواکەی دهۆک و دواتر کوشتنیشی لەلایەن هەرزەکارێکەوە کۆمەڵگەی کوردی توشی راچەڵەکاند کرد ، بەڵام ئەوەی جێی هەڵوەستە لەسەر کردنە بەشێک لەدەست درێژی کاران سزا نادرێن.

زۆر حاڵەتی تری دەستدرێژی شۆک هێنەر تۆمار کراون وەکو دەستدرێژی کردنە سەر خوشک لەلایەن براو دەستدرێژی کردنە سەر کچ لەلایەن باوکەوە، یان زۆر حاڵەتی کوشتن تۆمار کراوە کە کوژراوەکە پێش کوژرانی دەستدرێژیشی کراوەتە سەر، ئەگەرچی بەشی پێویست لەبەدواداچونی ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانە و سزادانیان کاری پێویست نەکراوە، هاوکات ئەوەی کە مایەی سەرنجە ئەوەیە کە قوربانیەکان جارێکی تریش دەبنەوە بە قوربانی، واتا ئەوانەی دەستدرێژییان دەکرێتە سەر هەر ئەوە نیە زیانی جەستەیی و دەرونیان پێدەگات، بەڵکو لەروی کۆمەڵایەتیشەوە دەبنە مایەی رەخنە و سوکایەتی پێکردن و بەکەم سەیر کردن.

پێموایە دام و دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەت و رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی بەرپرسیارێتیەکی گەورەیان دەکەوێتە ئەستۆ کە ئەویش هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگایە، چونکە شاردنەوەی حاڵەتەکانی دەستدرێژی پەیوەندی بە ناهۆشیاری کۆمەڵایەتیەوە هەیە کە پێویستە کۆمەڵگا لەم نەریتە دابماڵرێت، بۆ داماڵینی کۆمەڵگاش، پێویستە بوێر بین لە خستنەروی کێشەکەو هاوکاتیش جیدیی بین لە راگەیاندنی تاوانباران و قوربانیەکانیش لە بری ئەوەی ببنە مایەی لۆمە، کارێک بکەین بەشێک لەکاریگەریی تاوانەکەی لەسەر کەم بکەینەوە.

# ئافرەت وکۆت وبەندی کەلتور



■ شنە محەمەد



زانای بەریتانی بەناوبانگ (ئەدوارد تایلەر) لەکتێبێکیدا بەناوی کلتوری سەرەتاییدەڵێت کلتور:بریتیە لەو گشتە ئاڵۆزەی کە زانیاری و بیروباوەڕو ئاکارو فەلسەفەو هونەرو هەمو ئەو توانایانەش دەگرێتەوە کە تاک لە کۆمەڵگەکەیدا وەریدەگرێت بەو پێیەی کە ئەندامە تیایدا.

سەبارەت بە کەلتوری کوردیش، سەلام ناوخۆش لەکتێبی (ئافرەت و کەلتور)دا دەڵێت: "بریتیە لەسیفەت و هێمای کەلتوری جیاکەرەوە. ئەو سیفەتانە نوسراو نین ، بەڵکو هەم لەواقیعەوە دروستبون". هەم وەک لە کتێبی شوناس و کەلتوری کوردی هاتوە :"کەلتوری کوردی زادەی ئاینە کۆنەکانی کوردستانە".

سەدان دیاردەی کۆمەڵایەتی دواکەوتو و قێزەون لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا هەن بونەتە ئاستەنگ لەبەردەم پێشکەوتنی دا،دەبێت ڕیشەکێش بکرێن ،چونکە هیچ کۆمەڵگایەک لەجیهاندا ناتوانێ پەرەسەندن وپێشکەوتنی سیاسی وئابوری و کەلتوری بکات، ئەگەر شان بەشانی ئەوانەش پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەنجام نەدات. وەک فۆرییەش دەڵێت" پەرەسەندی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکارییەکانی سەردەم بەندە بەپێشەوەچونی ئافرەت بەرەوە ئازادی، فراوانی بونی دەسکەوتی ئافرەت بنەماو بناغەی هەمو پەرەسەندنێکی کۆمەڵایەتیە".

لەکۆمەڵگەی ئێمەدا کە کۆمەڵگەیەکی پیاوسالارییە هەمیشە ئافرەت بەپلە دو سەیرکراوە و، ئەوە خێزان و کۆمەڵگە بونە شوناسی مێینەیان دیاری کردوە ودیاری دەکەن و، جموجوڵەکانیان کۆنترۆڵ کردوە.

ڕیگە بەئافرەت نادەن هەست بە مێینەبونی خۆی بکات . ئەوان ئافرەتێکیان دەوێت لەژێر فەرمانەکانیاندا بێت وفەرمایشتەکانیان بەجێ بهێنن و گوێڕایەڵیان بن، دەیانەوێت ئافرەت وەک ڕۆبۆت بێت ئەوان هەرچییان وتو هەرچیان دانادەبێت جێبەجێ بکات و لێی لانەدا،هەر ئافرەتێک ئەگەر پێچەوانەی فەرمایشتەکانی ئەوان بێت ئیدی دەبێت بەنمونەیەکی ناشرین لەکۆمەڵگەدا. ئێمەی گەرمیانیش لە مەڵبەندێک دا دەژین هەتا ئەوڕۆش داب و نەریتی کۆن و عەشیرەتی دەوری ماوە و هەتا ئەوڕۆش عەیبەیە بۆئافرەت لەڕۆژێکدا دوجار لەماڵ بڕواتە دەرەوە ،جوان نیە ئافرەت لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بەدەرکەوێت.

پیاوەکانی بەناو ڕۆشنبیر دەستخۆشی و هیوای بەردەوامی بۆ ئافرەتەکانی دیکە دەخوازن ، کەچی ئامادە نین کچ یان دایک یان خێزانی خۆیان ببەن بۆ کوڕ و کۆبونەوەکان...هتد هەمان جەنابی ڕۆشنبیر بەرانبەر بەئافرەتەنزیکەکانی خۆی بەغیرەت دەبێت...

جا بۆ ئەوەی چیدیکە ئافرەتانی گەرمیان بە کەلتور و داب و نەریت کۆت و بەند نەکرێن و ئەوانیش وەک ئافرەتانی شارە پێشکەوتوەکانی کوردستان بن ،پێویستە لەسەر مەلایانی ئاینی کەکاری جدی بکەن لەسەر گۆڕینی تێڕوانینەکانی کۆمەڵگە بۆ ئافرەت ، چونکە ناوچەی گەرمیان ناوچەیەکی کۆمەڵایەتیە ئەوانەی کە زۆرتر گوێیان بۆدەگیرێت مەلاکانن.

هەمو دامودەزگا حکومییەکان و ڕێکخراوە مەدەنییەکانیش دەبێت کار بکەن لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاری خەڵکی و پاراستنی مافی تاک.

# ژن و ئایدیای کار



■ پەیمان ئەمین

دوابەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق بە شێوەیەکی گشتی کوردستان بەڕوی جیهاندا کرایەوە، کۆمەڵێ گۆڕانکاریی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و تەنانەت وشەی نوێیش هاتە نێو دنیای ڕاگەیاندن، دیارە ئەم کرانەوەیەی کومەڵگا ڕەنگدانەوەی بەسەر تاکەکانەوە بەجێهێشت، گەرمیانیش لەم نێوەندەدا هەنگاوی باشی نا، بە خستنەگەڕی کۆمەڵێ دەزگای میدیایی جیاواز لەناو ئەم دەزگایانەشدا دەرفەتێ ڕەخسا بۆ هاتنەپێشەوەی چەند خانمێک کە ئەمە بۆ کەلار و گەرمیان شتێکی نوێ بو.

لەم دواییەشدا دوای تەواو کردنی پروسەی خوێندن و دەرچون لە زانکۆ و پەیمانگاکاندا لە هەرێمی کوردستان، کە ماوەی چەند ساڵێکە حکومەت دەرفەتی دامەزراندنی بۆ دەرچوەکان نەڕەخساندوە بە گوێرەی پێویست، دیاردەی بێکاریی بە شێوەیەکی گشتی زیاتر کردوە و کاریگەریی هەبوە لەسەر کەسایەتییان بە جۆرێک هەندێکیان دەست دەبەن بۆ کومەڵێ کاری جیاواز، دیارە ئەو خوێندکارانەی کە خوێندنیان تەواو کردوە هەمیشە بەشوێن دەرفەت و هەلیکاردا دەگەڕێن و زورجار پەنا دەبەنە بەر کاری خۆبەخشی و کاری گروپ، هەروەها هەندێکار کە لە چاوی کومەڵگادا بە جیاواز تەماشا دەکرێن، لەمەدا ڕەنگە زیاتر کچان چانسی ئەوەیان هەبێ دەرفەتی کاریان بۆ ڕەخسابێ، چونکە لە دامودەزگا و تەنانەت دامەزراوە حکومیەکانیشدا زیاتر سیڤی کچان لە پێشترە، مەرجی ڕێکخراوەکان و نۆڕینگەکان و شۆپەکان ئەوەیە کە کارمەندیان لە ڕەگەزی مێ بێت، ئەوەی مایەی دڵخۆشیە ئیستا هاتنە مەیدانی ژنان و ڕکابەری پیاوانە، ئەمەش زیاتر خزمەت بەو توێژە دەکات، تێبینی ئەوەش دەکرێ کە لەم یەک دو ساڵەی دواییدا لە چالاکیە جۆربەجۆرەکاندا ژمارەی بەشداری ژنان زیاتری کردوە بەراورد بە دە ساڵی ڕابردو، ئێستا لە خولەکان و وۆرک شۆپەکان و هۆڵەکانی وەرزش و لەشجوانی و کارمەندانی کەناڵەکان و تەنانەت لەبواری بزنسیشدا ژنان دەرکەوتنیان هەیە و زیاتر هەوڵی خۆ پێگەیاندنی خۆیان دەدەن و کار بۆ ئەوە دەکەن جێدەستیان لە کۆمەڵگادا دیار بێت و ڕای جیاوازیان هەیە و گوێ لە ڕەخنە و بۆچونیشیان دەگیرێ، دیارە ژنان و کچان ئێستا لە ڕێگەی ئەو دەستە و گروپانەی کە خۆبەخۆ دروستی دەکەن و کاری تێدا دەکەن ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتانیشیان کەمتر و کاڵتر کردۆتەوە، چونکە ئەوان نایانەوێ بخزێنە ژێر کاریگەریی ئایدۆلۆژییەکی دیاریکراوەوە و پابەندبونیان نیە بە یەک مەبدەئو مەنهەجەوە و کاری فرە جۆر ئەنجام دەدەن، بەڵام ئەم هەڵکشانی ژمارەییەی بەشداری پێکردنی ژنان هێشتا دڵخوشکەر نیە، چونکە تا ژنێ دەبێتە نوسەر ژنێ دەکوژرێ، تا ژنێ دەچێتە شوێنی کارەکەی ژنێکیتر بەند دەکرێ لە چوارچێوەی دیواری ماڵدا، هەتا ژنێ بەشداری چالاکییەکان دەکات ژنێکیتر کەلەپچەی عورف و نەریت دەکرێتە دەستی، لە ئێستاشدا بڵاوکردنەوەی مانگنامەیەکی تایبەت بە خانمان لە گەرمیاندا جارێکیتر پێگەیاندنی دەستەیەکی زۆر باشە کە ئومێدی گەورەی لێدەکرێ بۆ ئایندەیەکی گەشی نادیار.

# ژنان رابەرایەتی کایەی رۆشنبیری گەرمیان دەکەن!





■ ژینۆ عەلی

سەرباری ئەو هەمو قەیران و کێشە جیاوازانەی بەرۆکی کوردستانی بەگشتی و گەرمیانی بەدیاریکراوی گرتوە، حاڵەتێکی موژدەبەخش لەم ماوەیەدا لەگەرمیان هەست پێدەکرێت، حاڵەتێک ساڵەهایە بۆی تێدەکۆشرێت و قسەی لەبارەوە دەکرێت، ئەویش هاتنە مەیدانی ژنانە بۆ کایەی رۆشنبیریی.

بەگشتی لەم ساڵانەی رابردودا، کایەی رۆشنبیریی لەگەرمیان وەکو کایەیەکی مۆنۆپۆڵ و قۆرغکراوی پیاوان دەرکەوتبو، ئەوەی کەمترین چالاکیی تیادا دەبینی یان دەگێڕا، ژنان بون.

بەڵام لەم دوساڵەی رابردو و بەتایبەتی ئەمساڵ، چالاکیە رۆشنبیرییەکانی ژنان، بەتایبەتی دەستپێشخەرییان لەکارکردن لەم بوارەدا، زۆر پەرەی سەندوە. ئەوە بەسە کە ئاماژە بەوەبکەین تەنها لەم ماوەیەدا ٣ گروپی رۆشنبیریی ژنان لەگەرمیان دامەزراون، کەئەوانیش گروپەکانی: (مەستورە، سۆفیا و پێشەنگ)ن.

ئەوەی ئەم گروپانە لەوانی تر جیادەکاتەوە سەرباری بێلایەنیی و حیزبیی نەبونیان، ئەوەیە کە ئەم گروپانە هەر ناو نین بەتەنیا و وەک هەندێک کەس و لایەن نین کە دوکانێک بن بۆ بازرگانی، یان بوارێک بێت بۆ نمایشی خود و بەدەستهێنانی دەستکەوت و قازانجی مادی و مەعنەویی کەسیی، بەڵکو ئەم گروپانە بە چالاکییەکانیان، خۆیان لە گروپەکانی تر جیاکردوەتەوە. زێدەڕۆیی نیە ئەگەر بڵێین، لە ماوەی ئەمساڵدا، هیچ رێکخراو و گروپێک، بەقەدەر ئەم گروپانەی ژنان چالاکییان نەبوە، بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئەم گروپانە هیچ کۆمەک و هاوکارییەکی مادیی ناکرێن لەلایەن لایەنە فەرمییەکانەوەو کارەکانیان خۆبەخشییە.

ئەم تەوژمە رۆشنبیرییە پڕ حەماس و جوڵەیەی ژنان و کچانی گەرمیان، بەدەستپێکی دروست و بنەمای گونجاو و واقیعی هاتونەتە بون، ئەوان سەرەتا بە خۆرۆشنبیکردنی کچان و هەوڵدان بۆ پەرەدان بە کەلتوری خوێندنەوەو وروژاندنی گفتوگۆ و پرسیاری رۆشنبیریی دەستیانپێکردوەو دواتر ویستویانە بەشداریەکانیان لەپەرەپێدان بە ئاستی رۆشنبیریی کچان و ژنان بەرەوپێشەوەبەرن و هەنگاوی تر هەڵبنێن، ئەمەش دەرخەری جیدیەتی ئەم تەوژمەو گرنگیی کارەکەیانە.

کەواتا ئەوەی ساڵەهابو قسەی لەبارەوە دەکرا بۆ هاتنە مەیدانی ژنان لەکایەی رۆشنبیریی دا لەگەرمیان، ئێستا هاتوەتە بون. پرسیار ئەوەیە: چی بکرێت و کێ بیکات بۆ دەستگرۆییکردنی ئەم کچانەو هاوکارییکردنیان بۆ گەشەپێدانی زیاتر بە هەوڵەکانیان؟ رۆڵی دامودەزگا رۆشنبیریی و سەنتەر و خودی رۆشنبیران چیی دەبێت لەم روەوە، بەشدار دەبن لەپەرەپێدان بە هەوڵەکان یان هەر رۆڵی تەماشاکەر دەبینن؟

# تاکە ژنە بەقاڵەکەی کفری


ئامینە خان لەدوکانەکەیدا

▪ نەوژین — ئەشرەف ئەحمەد

**لەنێو بازاڕە کۆنەکەی قەزای کفری، لەیەکێک لە دوکانەکانی ئەم بازاڕە، دیمەنێک دەبینرێت کە تارادەیەکی زۆر نامۆیە بە کەشی بازاڕ، ئەویش بونی ژنێکی فرۆشیاری سەوزە و میوەیە.**

لەو بازاڕەدا کە سەرجەم پیشەوەرەکانی پیاون، ژنێک بە تەنیا دوکانێکی بەقاڵی بەڕێوەدەبات و بژێوی ژیانی پێدابین دەکات.

ئامینە نوری محەمەد، تەمەن ٥٠ ساڵ، تاکە ژنە لە قەزای کفری، دوکانێکی تایبەت بە خۆی کردوەتەوە. ئەو هاوشێوەی پیاوان، ڕۆژانە لە دوکانەکەیدا کاسبی دەکات و سەوزەو میوە دەفرۆشێت.

ئەو باسلەوەدەکات مێردەکەی پێشتر ئەم دوکانەی هەبوە، دوای ئەوەی کۆچی دوایی کردوە، ئەمیش بۆ بۆبژێویی ژیانی، بەردەوام بوە لە دوکانەکەو کاسبی تێدا دەکات.

ئامینە وتی: ”پێشتر مێردەکەم دوکانەکەی هەبوەو کاری سەوزە فرۆشتنی کردوە، دواتر کۆچی دوایی کرد، منیش بڕیارمدا کە دوکانەکە بەردەوامی پێبدەن و بژێوی خۆمی پێ پەیدا بکەم“.

وتیشی: ”ئەم کارە باشترە لەگشت شتێک، ئەگەرچی براکانم زۆر چاکن لەگەڵما و زۆر هاوکاریم دەکەن، بەڵام خۆم دڵم رەحەت نابێت بچمە ئەملاو ئەولا، بۆیە ئەم دوکانەم داناوە“.

بەوپێیەی کۆمەڵگەی کوردیی، بە کۆمەڵگەیی پیاوسالاریی ناسراوە، بۆیە کارکردنی ژنان لە بازاڕ دا بەتایبەت لە پیشەی وەکو دوکانداریی، بە پیشەیەکی تەواو پیاوانە هەژمار دەکرێت و زۆر بەکەمی ژنان خۆیان لە قەرەی دەدەن. بەڵام ئایا (ئامینە) لەلایەن کۆمەڵگەو کەسوکارەکەیەوە، چی پێوتراوە لەسەر کارکردنی؟ تا چەند ئاستەنگی بۆ دروستکراوە؟

ئامینە وەڵام دەداتەوە: ”کەسیان نەیانوت باسێ یان حاڵێ، زۆر باش و حەنینن لەگەڵم و هەموکاتێ پشتگیریم دەکەن و هیچ جارێ ڕێگریان لێم نەکردوە بۆ ئیشەکەم“.

وتیشی: ”ئەگەر لەدوکانەکەشدا بمێنمەوە ئەوان هیچ ناڵێن، چونکە متمانەیان پێمەو پشتیوانمن“.

ئاماژەی دا کە مامەڵەی هاوڵاتیانیش لەگەڵی دا زۆر باش و ئاساییەو تائێستا روبەڕوی هیچ کێشەو ئاستەنگێک نەهاتوەتەوە.

وتیشی: ”کەس هیچێکی خراپی پێم نەوتوە، بەڵکو هەموی ڕێزم دەگرێت و منیش ئیشوکارەکەم بەباشیی دەکەم“.

ڕەنگە پێش چەند ساڵێک، قورس ببوایە ڕێگە بە ژنێک بدرێت بۆ ئەوەی ببێتە پیشەوەر، بەڵام ئامینە توانی ئەو کۆتە بشکێنێ و ئێستا ڕۆژانە لە دوکانەکەی سەرقاڵی کاسبییە، پرسیار ئەوەیە: ئایا ئەم ڕچە شکاندنە پەیوەندی بە خودی کەسەکانەوە هەیە، یاخود گۆڕینی بیروباوەڕ و کرانەوەی زیاتری کۆمەڵگا؟

> **”کەس هیچێکی خراپی پێم نەوتوە“**

---

# شەدا، ژنە شۆفێرەکەی خانەقی

▪ نەوژین– ئەحمەد حەمید

**پاسەکەی شەدا، پڕبو لەو کچە خوێندکارانەی کە بەهۆی نەریتی ناوچەکەوە، کەسوکارەکانیان هەمیشە چاویان لەسەریانە و نایانەوێت لەگەڵ شۆفێری پیاودا بیاننێرنە قوتابخانە.**

ئەو کە جبەیەکی لەبەردابو دەستبەرداری جلە نەریتیەکەی نەبو بو، بەڵام پیشەیەکی هەڵبژاردوە کە نەریت شکێنە.

شەدا قاسم، تاکە ژنە لە گەرمیان و گەرمەسێر، دەستی بۆ پیشەیەک بردوە کە تارادەیەکی زۆر بە پیشەیەکی ”پیاوانە“ ناسراوە و لە ڕابردودا هیچ ژنێک نەیتوانیوە خۆی لە قەرەی بدات، ئەو پیشەیەش شۆفێریکردنی پاسە.

ئەو لە قەزای خانەقین دادەنیشێت و خاوەنی چوار منداڵە (٣ کچ و کوڕێک)، ماوەی پێنج ساڵە بە مینی پاسە مۆدێل کۆنەکەی بژێوی خێزانەکەی پەیدا دەکات.

شەدا، هەرچەندە ژیان بەتەواوی ماندوی کردبو، بەڵام بە ڕویەکی گەشەوە خوێندکارەکانی بەڕێدەخست و لە ماڵەوە تا دەیگەیاندنە قوتابخانە چاودێری دەکردن و بەپێچەوانەشەوە، ئەو وتی: ”پیشەکەمم زۆرم خۆش دەوێت و نامەوێت دەستبەرداری بم“.

بەپێی ئامارێکی بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی گەرمیان کە خانەقینیش دەگرێتەوە، لەماوەی (یەک) ساڵی ڕابردودا، (٩٣٠) ژن مۆڵەتی شۆفێرییان پێدراوە، کە تەنها (١٣) مۆڵەتی گشتی تێدایە، بەڵام شەدا تەنها ژنە کە سودی لە مۆڵەتە گشتیەکەی وەرگرتوە و بوە بە شۆفێری مینی پاس بۆ پەیداکردنی بژێویی ژیانی.

شەدا بەدەم پاککردنەوەی جامی ئۆتۆمبیلەکەیەوە، باسی لەوەکرد کە ئەو پێشتریش زۆر ئارەزوی لە شۆفێری هەبوە، ئەمەش هانی داوە کە حەزەکەی بکاتە پیشە. وتیشی: ”ئەوەی کارەکەی بۆ ئاسانکردنم هاوکاریکردنی هاوسەرەکەم بو کە پشتگیرییەکی زۆری کردم“.

بەهۆی تانەو تەشەری کۆمەڵگاوە، کەمن ئەو ژنانەی کە هاوسەرەکانیان ڕێگەی ئەنجامدانی پیشەی (پیاوانەیان) پێدەدات، بەڵام سەعد نەک لەمپەر لەبەردەم شەدادا دروست ناکات، بەڵکو بیر لەوە دەکاتەوە ئۆتۆمبێلەکەشی بە یەکێکی نوێتر بۆ بگۆڕێت

(سەعد حسێن)ی هاوسەری شەدا، کە خۆی ماتۆڕسکیلێکی پێبو، وەکو خۆی ئاماژەی بۆ کرد: ”خۆشحاڵە کە هاوسەرەکەی پیشەیەکی جیاوازی هەڵبژاردوە و سەرکەوتو بوە تێیدا“.

ئەوی زیاتر سەعدی خوشحاڵ کرد ، ئەوەبو کە هاوسەرەکەی وێڕای پەیداکردنی بژێوی ژیانی، هاوکات خزمەتی ئەو خوێندکارە کچانەش دەکات کە کەسوکارەکانیان لەبەر کێشەی هاتوچۆ ڕەنگە لەمپەڕیان لەبەردەم درێژەدانیان بەخوێندن بۆ دروست بکردنایە.

شەدا مینی پاسێکی ١٤ نەفەری پێبو، بەڵام ڕۆژانە ٢٠ کچە خوێندکار بێ گوێدانە تەنگی جێگەکانیان هاتوچۆیان لەگەڵ دەکرد.

زەینەب عامر، یەکێکە لەو خوێندکارانەی ڕۆژانە لەگەڵ شەدادا هاتوچۆی خوێندنگا دەکات، دەڵێت: ”هەرچەندە ژمارەی کورسییەکانی مینی پاسەکەی شەدا بەراورد بەژمارەی ئێمە کەمترە، بەڵام شەدا وەکو دایک مامەڵەمان لەگەڵ دەکات و ئاسودەین لەگەڵیدا“.

شەدا بە شۆفێری کردن تەنها کارێکی پیاوانەی جیاوازی ئەنجام نەداوە، بەڵکو ئەو نەریتە پیاوسالارییەی تێکشکاندوە کە ژنانی ئاخنیوەتە کونجی ماڵەکانیان و بە تێکشکاندنی ئەو نەریتانە ژنان ڕوبەڕوی هەڕەشە و تەنانەت کوشتنیش دەبونەوە.

عەباس عەبدولکەریم، توێژەری کۆمەڵایەتی، بڕوای وایە چونە دەرەوەی ژنان لە ماڵ و کارکردنیان لە دەرەوە، هەوڵێکە بۆ تێکشکاندنی نەریتە کۆمەڵایەتییەکان.


شەدا لەتەنیشت ئۆتۆمبیلەکەیەوە

عەباس دەڵێت: ”ئەم کارەی شەدا ئەگەر ژنانی تر چاوی لێبکەن ببێتە دیاردە، دەکرێت وەکو شۆڕشی ژنان لەدژی بە ماڵیکردنیان لێی بڕوانین“.

زۆربەی ئەو خێزانانەی دژی چونە دەرەوەی کچ و ژنانن بۆ کارکردن، لەڕوانگەی ئاینەوە دەڕواننە مەسەلەکە و پێیانوایە کارکردنی ژنان شان بەشانی پیاوان لەڕوی ئاینییەوە کارێکی نادروست و ڕێگەپێنەدراوە.

بەڵام مەلا حەسەن کەلاری هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا لە شەریعەتی ئیسلامی، ڕایگەیاند: ”لەئیسلامدا ڕێگە بەژنان دراوە کاربکەن بەو مەرجەی کارەکەی حەرام نەبێت و تێیدا سنورەکانی شەرع بپارێزێت“.

تاچەند ساڵێک لەمەوبەر و لەبەشێک لە ناوچەکانی کوردستان ڕۆیشتنە دەرەوەی ژنان بەتەنها نەگونجاو بو، بەڵام لەئێستادا ژمارەی ئەو کچ و ژنانە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەهەڵکشاندایە کە لەدەرەوە ئەو جۆرە کارانە دەکەن کە بەپیشەی پیاوانە ناسراون و پێشتر بۆ ژنان قەدەغەبون.

شەدا قاسم لەکۆتایی قسەکانیدا داوای لە ڕێکخراوەکانی بواری ژنان کرد هاوکاری ژنان بکەن بۆ تێکشکاندنی نەریتە کۆن و سواوەکان، وتی: ”ناکرێت ژنان تەنها چاویان لەدەستی پیاوان بێت، بەڵکو دەبێت ژنان خۆشیان خاوەنی ئابوری سەربەخۆ بن“.

> **”لەئیسلامدا ڕێگە بەژنان دراوە کاربکەن“**

**ئەم ڕاپۆرتە پێشتر لە وێبسایتی (وێستگە) بڵاوکراوەتەوە**

# سەرەڕای بەربەستەکان کچانی گەرمیان رو لە بواری هونەر دەکەن

**▪ نەوژین — ئالا عەزیز، سەرگوڵ خەلیل**

**ئەو بەربەستانەی دێنە پێش کچان لەگەرمیان، سارد و بێئومێدی نەکردونەتەوە لە هەوڵدان، بەڵکو توانیویانە بەشێکی ئەو بەربەستانە بشکێنن و رو لەبواری هونەر بکەن بەتاییبەتی هونەری شێوەکاری.**

بەگشتی کایەی هونەر لەگەرمیان، تارادەیەکی زۆر کایەیەکی قۆرغکراوی پیاوانە، بەڵام بەوتەی مامۆستایانی هونەر و چالاکوانانی گەنجان، لەم دواییانەدا، ئاستی بەشداری کچان لەو کایەدا برەوی سەندوە. خودی ئەو کچانەشی کە خولیای هونەریان هەیە، جەخت لەوەدەکەنەوە کە بەربەستەکان نایانوەستێنێت.

ڕێنواز نامیق، ١٩ ساڵ، خوێندکارە لەپەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری، بە (نەوژین)ی وت: ”من بەربەستی زۆرم هاتوەتە پێش، بەڵام بە هەوڵ و ماندوبونی خۆم توانیومە ئەو بەربەستانە بشکێنم و بەحەز و ئاواتی خۆم بگەم“.

وتیشی: ”ئامانجم ئەوەیە کە لەداهاتودا خوێندکاری خۆم هەبێت و کەسانی تر سودمەند بکەم“.

بەگشتی کچان حەز و ئارەزویەکی تاییبەتیان هەیە بۆ هونەر، بەڵام بەهۆی زاڵبونی کلتوریی پیاوسالاریەوە، بەشێکی زۆری کچانی گەرمیان ڕێگریان لێ دەکرێ کە بێنە نێو ئەم بوارەو گەشە بە ئارەزوەکانیان بدەن.

بێریڤان محەمەد، ١٨ ساڵ، کەلەبەشی شێوەکاریی سەنتەری چالاکیی گەنجانی کەلار دواندمان، سەرقاڵی وێنەکێشان بو.

بۆ (نەوژین) وتی: ”کچان تواناکانیان باشترە لەکوڕان لەم بوارەدا، بەڵام لەگۆمەڵگای ئێمە تاوەکو ئێستاش ڕێگری لە کچان دەکرێت کە بەحەز و ئارەزوی خۆیان بگەن“.

بێریڤان، ئاماژەی بەوەکرد کە سەرباری ئەم بارە کۆمەڵایەتییە، بەڵام ئەو وەکو خۆی ڕێگری لێنەکراوە لەلایەن خێزانەکەیەوەو دەرفەتی پێدراوە.

وتیشی: ”من هیچ بەربەستێک نەهاتوەتە ڕێم، هەوڵیشم داوە هاوڕێکانم ئەو بەربەستانە بشکێنن و بێنە نێو دونیای هونەرەوە“.

بەپێچەوانەی ئەو کچە شێوەکارەوە، بەڵام هەندێک لەکچان حەز و ئارەزوی زۆریان بۆ هونەر هەبوەو دەستیان بەکاری هونەر کردوە، بەڵام بەهۆی ڕێگری و ئەم کۆمەڵگایەوە نەیانتوانیوە تا کۆتایی بەردەوام بن.

توانا نەقی، مامۆستای هونەری موزیک لە سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار، جەختی لەو زانیارییە کردەوەو بۆ (نەوژین) وتی: ”وەکو بەشی مۆسیقا بەڕادەیەکی کەم کچان بەشداری دەکەن و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کلتورو کۆمەڵگای ئەم ناوچەیە کە کچان بەشداری لە بوارەکاندا بەشێوەیەکی کەم دەکەن“.

بەڵام ئەم ڕەوشە بۆ هونەری شێوەکاریی، بەتەواوی بەوشێوەیە نیە کە لە هونەری موزیک دا هەیە.

سەردار حەمید (نۆڕێ)، مامۆستا لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کفری، بە (نەوژین)ی وت: ”تەماشام کردوە کچان زوتر لەکوڕان فێر ئەبن، چونکە هەست ئەکەین خەون و خولیایەکیان هەیە“.

ئاماژەی دا ”ئێمە لەپشوەکانیشدا چەندین جار پێشانگامان کردوەتەوە بۆ کچان و بەشداریان زۆر باش بوە، لەداهاتوشدا هەر بەردەوام ئەبین لەکردنەوەی پێشانگا بۆیان“.

یەکێکە لەو ناوەندانەی کە ژمارەیەکی بەرچاو لە کچانی گەرمیان و کەلار بەتاییبەتی بۆ پەرەپێدان بەتوانا هونەرییەکانیان سەردانی دەکەن، سەنتەری چالاکی گەنجانە.

ئەو سەنتەرە سەر بە ڕێکخراوی منداڵپارێزی کوردستانەو لەساڵی ٢٠٠٢ وە لە کەلار دامەزراوە. بەوتەی بەڕێوەبەرەکەی، ڕێژەی روکردنی کچان لە بواری هونەر لەلای ئەوان و لەدەڤەرەکەش، بوەتە حاڵەتێکی بەرچاو.

نەبەز حەمید، بەڕێوبەری سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار، بە (نەوژین)ی وت: ”بەڕێژەیەکی بەرچاو کچان بەشداری لەکردنەوەی خولەکاندا ئەکەن بەتاییبەت هونەری شێوەکاری، بەهەمان شێوە لە کار و چالاکیەکانیش کچان دەورێکی باشیان هەیەو زیاتر لەنیوەی بەشداربوانی چالاکیە هونەریەکان بەتاییبەت هونەری شێوەکاریی، لە کچانن“.

بەپێی ئاماری سەنتەرەکە، لەکۆی ٤٢٧٩ گەنج کە لەمساڵدا سەردانی کردون، ١٥٣١ یان کچ بوە، ئەمەش بەوتەی (نەبەز حەمید) ئەوە دەردەخات کە کچان بەشێوەیەکی بەرچاو رویان لەکایەی هونەر و پەرەدان بە ئارەزو و خولیاکانیان کردوە.

# (مەستورە) لەگەرمیان دەژێتەوە

**▪ نەوژین — سەرگوڵ خەلیل، پەیام لەتیف**

**ئەگەرچی نە ڕێکخراوە و نە سەنتەرێکی تاییبەت، بەڵام ناوی ”گروپی مەستورە“، لەوناوانەیە کە لە بواری ڕۆشنبیریی ژنان دا لەگەرمیان، ناسراو و چالاکە.**

ئەم گروپە، لە ژمارەیەک کچی چالاک پێکدێت، کە وەکخۆیان دەیڵێن: خەمی خزمەتکردن بە کایەی ڕۆشنبیریی بەگشتی و ژنان بەتاییبەتی، کۆی کردونەتەوە.

گروپەکە، ناوی خۆی لە (مەستورەخانی ئەردەڵانی)یەوە وەرگرتوە، کە یەکێکە لە پێشینەترین نوسەرانی ژنی کورد و بەتاییبەت بە نوسینەوەی مێژوی ئەردەڵانیەکان، ناوبانگی ڕۆشتوە.

لەبەرواری ٢٠١٥ ,٦ ,٢٥، گروپی مەستورە، لەسەر دەستی سێ کچ دامەزراوە. بەرەبەرە چالاکیەکانی گروپەکەو ژمارەی ئەندامەکانیشی روی لەهەڵکشان کردوە، تابەئاستێک گەیشتوە کە هەگبەی گروپەکە بۆ کۆتایی ئەمساڵ، گەیشتوەتە زیاتر لە ٤٠ پرۆژە و ٧٠ چالاکی، ژمارەی ئەندامەکانیشیان، ٢٠ کچی تری بۆ سەربار بوە.

ئەم ٢٣ کچەی کە لە گروپێکدا کۆبونەتەوە، گەرەکیانە چیی بکەن و چیی بڵێن؟

نزا محەمەد، بەرپرسی گروپی مەستورە، وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: ”ئامانجمان ئەوەیە ئەم کچانە ببنە نوخبەی گەرمیان“.

بەڵام خەونی هەندێک لە ئەندامانی گروپەکە، گەورەترە هەر لە ناوچەکەدا نوخبەو دەستەبژێر بن، بەڵکو وەکو (ئەسما عەزیز)، کە ئەندامێکی گروپەکەیە، ئاماژەی بۆکرد، دەیەوێت لەڕێگەی گروپەکەوە خانمانی کورد بە دونیای دەرەوە بناسێنن.

ئەسما، ئەگەرچی تەنها مانگێکە پەیوەندیی بە گروپەکەوە کردوە، بەڵام وەکخۆی وتی: ”ئەمەوێ زیاتر ڕۆشنبیر بم“.

زۆربەی چالاکیەکانی گروپی مەستورە، لە بۆنەو یاد و ڕۆژە جیهانیەکاندا رەنگی داوەتەوە.

بەرپرسی گروپەکە جەخت لەم زانیارییە دەکاتەوە و دەڵێت: ”ئێمە یەکێک لەو شتانەی جەختی لێ دەکەینەوە بۆنە جیهانیەکانە کە دێنە پێشەوە، بۆ ئەم بۆنانە چالاکی تاییبەتمان هەیە بەتاییبەت ئەو بۆنانەی تاییبەتن بە ئافرەتان“.

(ئەسما)ش، وایدەبینێت کە یەکێک لە ئەرک و کارە باشەکانی گروپەکە ئەوەیە کچان دەجولێنێ و دەیەوێت لە چوارچێوەی ماڵەکانیان دا قەتیس نەبن و سەرکوت بکرێن ”زۆربەی کێشەی ئافرەت هۆکارەکەی ئەوەیە لەماڵەوە سەرکوت ئەکرێ، هیوادارم ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لەنێوماندا نەمێنێ“.

وەک بەرپرسەکەی ئاماژەی بۆ کرد: گروپی مەستورە، لەروی مەعنەویەوە پشت بەخۆیان و چەند پسپۆڕێکی تر دەبەستن، لەروی ماددیشەوە کارەکانیان بەسپۆنسەر ئەڕوات بەڕێوە.

لە ئێستادا ٢٦ گروپی مۆڵەت پێ دراو هەیە لە هەموو گەرمیاندا، واتا لەشارەکانی: (کەلار، کفری، خانەقین و دوزخورماتو)، بەڵام ”مەستورە“ یەکێک نیە لەو گروپانە!

ئاکۆ یوسف (ئاکۆ هۆڕێنی)، بەڕێوبەری گشتی ڕۆشنبیری و هونەری گەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: ”ئێمە گروپمان هەیە لەبوارە جیاوازەکاندا (شانۆ، فۆتۆگرافی، شێوەکاری، دەف، هونەری منداڵان و چەند بوارێکی دیکە)، ئەم گروپانە پیاوی تیایە و خانمیشی تیایە، گروپی تاییبەت بە ئافرەت نییە تەنها تاییبەت بێت بە ڕۆشنبیری خانمان یان هونەری خانمان“.

لەبارەی ئەوەی بۆچی مۆڵەت بە گروپی مەستورە نەدراوە، ئاکۆ هۆڕێنی وتی: ”چەند گروپێک هەن ڕێکارە یاساییەکانیان تەواو کردوەو تەنها هەندێ کاریان ماوە، یەکێک لەو گروپانە (مەستورەی گەرمیان)ە“.

# نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب...نەخۆشی زۆر و پزیشكی كەم

■ نەوژین – سەرگوڵ خەلیل، ئالاعەزیز

**(ئامینە محەمەد)ی تەمەن (٣٥) ساڵ، بۆ ئەوەی بتوانێت راوێژی تەندروستی بە پزیشكێكی ژنان بكات لە نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب، ئەبێت ماوەیەكی زۆر لە چاوەڕوانی دا بمێنێتەوە.**




نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب

ئەو و هاوتاكانی، بەهۆی كەمی ژمارەی پزیشكەوە، هەركاتێك سەردانی نەخۆشخانەكە بكەن، ئەبێت تاقێك لە كاتی خۆیان تەرخان بكەن، ئەگەر بە مەبەستی خۆیان بگەن و چارەسەری پێویست وەربگرن.

ئەم كێشەیە بەوتەی ئامینە، بەهۆی كەمی ژمارەی پزیشكەكانی بواری ژنان و منالبونە، كێشەیەك كە بە "ئەزەلی" ناودەبرێت لەگەرمیان و بەرپرسانی نەخۆشخانەكەش جەختی لێدەكەنەوە.

نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب بۆ ژنان و منالبون، تاكە نەخۆشخانەی لەوشێوەیەیە لە گەرمیان، هەربۆیە فشارێكی زۆری لەسەرەو سەردانیكەرانی زۆرن.

لەبەرامبەر ئەو فشار و ژمارە زۆرەی سەردانیكەران، بەڵام ژمارەی پزیشكەكان نەك بەپێی پێویست نین، بەڵكو زۆر كەمیشن.

د. بەناز جەلیل، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەكە، جەخت لەو زانیارییانە دەكاتەوە.

ئەو بۆ نەوژین‌ی وت: "ئێمە لەنەخۆشخانەكەمان كێشەی كەمی پزیشكمان هەیە لە روی (پزیشكی پسپۆڕ و پزیشكی نیشتەجێی خولاو و پزیشكی نیشتەجێی دێرین)ەوە."

وتیشی: "لەحاڵەتی هەبونی ئەو جۆرە پزیشكانە تەنیا لە حاڵەتی پێویست یان نەتوانی چارەسەر كردنی نەخۆشێك لەلایەن ئەو پزیشكانەوە پەنا دەبرێتە بەر پزیشكی پسپۆڕ بۆ چارەسەركردنی نەخۆش، ئەمەیش كاری ئێمەی قورس كردوە و ئەركی پزیشكە پسپۆڕەكانی زیاد كردوە."

ئەم حاڵەتە، وایكردوە ژنانی نەخۆش كە سەردانی نەخۆشخانەكە دەكەن، هەست بە ناڕەحەتی و نیگەرانی زۆر بكەن.

> **داوامان كردوە بۆ ئەوەی كێشەكەمان بۆ چارەسەر بكەن**

ئامینە محەمەد، ئەو ژنەی لە سەرەی چاوەڕوانی دا لەنێو نەخۆشخانەكە بینیمان، لەوبارەوە دەڵێت: " ئەگەر بمەوێت سەردانی نەخۆشخانەكە بكەم ئەوا ئەبێت كاتێكی زۆر چاوەڕوان بم تا بتوانم پزیشك ببینم، ئەمەیش كاتێكی زۆرمان لێ ئەگرێت و دوامان دەخات لە كاری رۆژانەمان."

هاوڵاتیان وبەرپرسانی نەخۆشخانەكەش، جەخت لە بونی كێشەی كەمی پزیشك دەكەنەوەو بە بارگرانیی بۆسەر نەخۆش و نەخۆشخانەكەی دەزانن، بەڵام پرسیار ئەوەیە: چی هەوڵێك بۆ چارەسەری ئەم كێشەیە دراوە؟

د.بەناز جەلیل، لەوەڵامدا دەڵێت: "داوامان لەسەروی خۆمان كردوە بۆ ئەوەی كێشەكەمان بۆ چارەسەر بكەن، بەڵام تا ئێستا هیچ ئەنجامێكی نەبوە."

---

# گەرمیان: نەخۆشی درێژخایەنی ئافرەتان زیادی كردوە

■ نەوژین– سۆزان خەلیل

**لە گەرمیان رێژەی نەخۆشی درێژخایەن لە ناو ئافرەتاندا بە بەراورد بە ساڵی رابردو زیادی كردوە، توێژەرێكی دەرونیش دەڵێت: بەشێك لەو نەخۆشانە گیرۆدەی نەخۆشیەكانیان بون.**

نەخۆشی درێژ خایەن یەكێكیە لە هەرەشە مەترسیدارەكان بۆ سەر مرۆڤ و زۆربەی توشبوانی نەخۆسیە درێژخایەنەكان بە درێژای تەمەن نەخۆشیەكە هاورێیانە . بە پێی ئامارەكان لە ساڵی (٢٠١٤-٢٠١٥) لە گەرمیان (٥٢,٥٠٠) نەخۆشی درێژخایەن تۆمار كراوە.

لەیلا حوسێن محەمەد، یەكێكە لەو ئافرەتانەی نەخۆشی درێژخایەنی هەیە "نەخۆشی شەكرە" بۆ (نەوژین) دوا و وتی:" ماوەی ٤ ساڵە لە نەخۆشخانەی گشتی كەلار دەرمان وەردەگرم، دەرمانەكانم هەموی بەكاردێنم و زۆرباشە و سودێكی زۆر باشی هەیە."

لەیلا دەشڵێت:"ئەم نەخۆشیەی من بۆ ماوەییە و لە بنەماڵەكەماندایە."

بە پێی ئامارێكی بەرێوبەرایەتی تەندروستی گەرمیان لە ساڵی (٢٠١٥) دا نزیكەی شەش هەزار توشبوی نەخۆشیە درێژخایەنەكان زیادی كردوە، بەڵام بە هۆی گرفتی تەكنیكیەوە ئاماری ئەم ساڵیان لەبەر دەستدا نیە.

سورەیا ئەحمەد، كە توشبویەكی دیكەی نەخۆشیە درێژخایەنەكانە، بۆ (نەوژین) وتی:"گرفتێكی وامان لەگەڵ دكتۆرەكان نیە و بە شێوەیەكی باش بە دەممانەوەن و هاوكاریمان دەكەن."

سورەیا لەبارەی ئەوگرفتانەی روبەرویان دەبێتەوە زیاتر دواو دەڵێ: "گرفتمان ئەوەیە هەندێكجار دەرمانەكانمان لە نەخۆشخانە دەست ناكەوێ و دەبێت برۆین لەدەرمانخانەكانی دەرەوە بیكرین."

هاوكات پزیشكان باس لەوە دەكەن بەشێك لەو كەسانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە لەژێر كاریگەری دابونەریتە كۆمەڵایەتیەكاندا




سەردانی شێخ و مەلا و كەسایەتیە ئاینیەكان دەكەن.

واسق كەریم، پزیشكی پسپۆری هەناویی، بە (نەوژین)ی وت: "هۆكاری نەخۆشی درێژخایەن جیاوازە و بە پێی جۆری نەخۆشیەكە هۆكارەكەی دەگۆرێت، بۆنمونە ژینگە كاریگەریەكی ئەوتۆی لەسەر نەخۆشیەكانی دیكە نیە، جگە لە نەخۆشی (رەبو) كە كاركردن لە شوێنی نا تەندروست هۆكارە بۆ توشبونی."

لە بارەی گواستنەوە نەخۆشیە درێژخایەنەكان لەكەسێكەوە بۆ كەسێكی تر، د.واسق دەڵێت:"نەخۆشیە درێژخایەنەكان لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر ناگوازرێتەوە."

سەرەڕای بە كارهێنانی دەرمان و چارەسەرە پزیشكیەكان، لایەنێكی دیكەی كاریگەر هەیە بۆ زاڵبون بەسەر ئەو نەخۆشیانەدا، ئەویش لایەنی دەرونی مرۆڤە، توێژەرانی دەرەونی دەڵێن "تاوەكو مرۆڤ لایەنی دەرونی بەهێزبێت باشتر بەسەر نەخۆشیەكەدا زاڵ دەبێت".

سنور ئەحمەد، راوێژكاری دەرونی و كۆمەڵایەتی لەسەنتەری راهێنان و چارەسەری دەرونی گەرمیان، بۆ (نەوژین) وتی: "نەحۆشی درێژخایەن مانای گیرۆدە بون دەگەیەنێت، ئەو نەخۆشانەی سەردانی ئێمە دەكەن بە چەند رێگەیەك لەوانە (گفتوگۆی تایبەت و كۆكردنەوەیان بە گروپ) هەوڵدەدەین لە گەڵ بارودۆخەكەدا رایانبێنین و زاڵبن بەسەر ئەو دۆخەدا."

سنور، دەشڵێت:"هەوڵدەدەین لە رێگەی گروپەوە پێكەوە كۆیان یكەینەوە بۆ ئەوەی سود لە یەكتر وەربگرن لەو روەی كە بزانن تەنیا نین و ئەو رێگایانەش كە بەسەر نەخۆشیەكەدا زاڵ دەبن بە یەكتری ئاشنا بكەن."

> **تاوەكو مرۆڤ لایەنی دەرونی بەهێزبێت باشتر بەسەر نەخۆشیەكەدا زاڵ دەبێت**

# ئافرەتانی گەرمیان رو لە هۆڵەکانی لەشجوانی دەکەن

■ نەوژین – سەرگوڵ خەلیل، ئالا عەزیز

**کە چوینە ناو هۆڵەکەوە، دیمەنێکمان بینی کە رەنگە زۆرینەمان باوەڕ نەکەین لە گەرمیاندابین. ژمارەیەک ژن و کچ لە تەمەن و ئاستی جیاجیا، سەرقاڵی راهێنانی وەرزشیی و یاری لەشجوانیین. ئەوان هەریەکەو بەجۆرێک لە راهێنانەوە سەرقاڵ بون، ئەگەرچی راهێنانەکان ماندوی کردبون، بەڵام دڵخۆش و ئاسودە دیار بون.**

ئەو ژنانە، نمونەیەکن لە ژمارەیەکی زۆرتری ژنانی گەرمیان کە ماوەیەکە دەستیان داوەتە راهێنانی وەرزشیی لە هۆڵە داخراوەکانی لەشجوانی. ئەم وەرزشە ئەگەرچی پێشتر بون و کردنەوەی ئاستەم و مەحاڵ بو، بەڵام لەئێستادا ژنان توانیویانە ئەو مەحاڵە بکەنە واقیع و هۆڵەکان پڕ بکەن لە بون و وزەو چالاکییان.

ئاشتی ساڵەح، ٣٤ ساڵ، یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە رۆژانە سەردانی هۆڵی راهێنانی وەرزشی و لەشجوانی دەکات. لە راهێنانەکەی دامانبڕیی و پرسیاری ئەوەمان لێکرد کە بۆچی هاتوە بۆ ئەم هۆڵەو دەیەوێت چیی بەدەست بێنێت؟ ئاشتی وتی: ”ئامانجی من لەسەردانکردنم بۆ ئێرە ئەوەیە کە لەشێکی جوان و تەندروستییەکی باشم هەبێت، من لە پاش هاتنم بۆ ئێرە زۆر هەست بە باش بونی لایەنی تەندروستیم دەکەم، وەرزشکردن لێرە وای لێکردوم هەست بە ئارامی دەرونیش بکەم“.

لە کۆمەڵگایەکدا کە زۆر شت بۆ ئافرەت بە عەیبە و نەگونجاو دادەنرێت، سەختە ژنان بتوانن خولیاو ویستەکانیان بەئاسانی بەدیی بێنن. بەڵام ئەوانەی کە سەردانی هۆڵە وەرزشییەکان دەکەن، توانیویانە پاڵپشتی خێزان و کەسوکاریان بەدەست بێنن، ئەمەش وایکردوە گوێ بەو جۆرە قسەو تێڕوانینانەی کۆمەڵگا نەدەن.

شیرین ئەحمەد، ئافرەتێکی ماڵەوەیە و یەکێکە لەوانەی سەردانی هۆڵەکانی لەشجوانی دەکات. بۆ (نەوژین) دوا و وتی: ”من سەردانی ئێرە دەکەم بۆ ئەوەی بتوانم لە رێگەی وەرزشکردنم تەندروستییەکی باش بەدەست بهێنم و گرنگی بەخۆم بدەم، لەو کاتەوەی سەردانی ئێرە دەکەم زۆر هەست بە باشبونی تەندروستیم دەکەم و کەمتر دەرمان بەکار دەهێنم، خێزان و دەوروبەریشم پاڵپشتییەکی باشم دەکەن“.

ئەوانەی کە سەردانی هۆڵەکان دەکەن، لە تەمەن و ئاستی کۆمەڵایەتی و خوێندن دا جیاوازن، بەڵام هەمویان لە گرنگیی بونی ئەم هۆڵانە بۆ ژنان، هاوڕاو و کۆکن.

چیابان محەمەد، ١٩ساڵ، یەکێکە لەو کچانەی سەردانی هۆڵی وەرزشی و لەشجوانی دەکات. دەڵێت: ”لەو کاتەوەی دەستم بە وەرزشکردن کردوە، زۆر هەست بە باشبون دەکەم و وەرزشکردن هەستێکی ئارامی پێ بەخشیوم و وای لێ کردوم بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو شتانە لەبیر بکەم کە بۆتە هۆی ناخۆشی بۆ ژیانم.“

لەبارەی قسەی دەوروبەر و رێگریەکانیشەوە، ئەو کچە وتی: ”من قسەی دەوروبەر زۆر گرنگ نییە بەلامەوە و زۆر گرنگی بە قسەی خەڵک نادەم، گرنگ ئامانجی خۆمە کە ئەمەوێ تەندروستییەکی باش و لەشێکی جوانم هەبێ“.

بەڵام ئایا تاچەند ئەو هۆڵە وەرزشییانە دەتوانن بەشداربن لە بەدەستهێنانی تەندروستیەکی باش و جەستەیەکی رێک بۆ ژنان؟ تا چەند هۆڵەکان لەروی پێکهاتەو ئامێر و راهێنەرەوە، گونجاون؟

ئاشتی ساڵەح، وتی: ”ئێمە زۆر لە هۆڵ و راهێنەرەکەمان رازین و زۆر یارمەتی دەرمانە لەکاتی وەرزشکردن، لە روی پاکوخاوینیشەوە ئێرە جێگایەکی باشە بۆ وەەرزشکردن.“

چیابان-یش، هەبونی ئەم شوێنانە بە گونجاو دەزانێت ”چونکە هەمو ئەو ئامێرە وەرزشییانەی تیایە کە دەتوانیت لە رێگەیەوە گرنگی بە خۆت بدەیت، لە روی پاکوخاوێنیشەوە جێگایەکی باشە و هەست بە ئارامی دەکەیت بە وەرزشکردن لێرە“.

بەوتەی راهێنەرێکیش، ژنان خواستێکی زۆریان لەسەر کردنەوەی ئەم هۆڵ و سەنتەرانە هەبوە، بۆیە هەستاون بەو کارە.

دەشنێ محەمەد، راهێنەری هۆڵێکی وەرزشیی تایبەت بە خانمانە، بۆ (نەوژین) وتی: ”ئافرەتان خواستێکی زۆریان لەسەر کردنەوەی ئەم جێگایە هەبو بۆیە ئێمەش بۆ خزمەتی ئەو کەسانە بڕیارمان دا کە رۆژانە کاتێکی دیاریی کراو تایبەت بکەین بە ئافرەتان لێرە“.

ئەو راهێنەرە ئاماژەی بەوەکرد کە رێژەی سەردانیکەرانی ژنان رۆژ دوای رۆژ رو لە زیادبونە ”ئێمە ماوەی یەک مانگە ئێرەمان کردوەتەوە رۆژانە نزیکەی (٦٠) ئافرەت سەردانی هۆڵەکە دەکەن و رێژەی ئەوانەش سەردانی ئێرە دەکەن تادێت زیاد دەکات.“

لەبارەی ئەوەی ئافرەتان لە چ تەمەنێک زۆرتری سەردانیان دەکەن، دەشنێ وتی: ”لەهەمو تەمەنێکی تیایە، بەزۆریش تەمەنیان لەنێوان (١٣ بۆ ٤٠) ساڵە.“



هۆڵێکی لەشجوانی لەکەلار

---

کچە وەرزشکاری گەرمیان (هۆزان):

# سەرباری رێگریەکان ژمارەی کچانی وەرزشکاری دەڤەرەکە رو لەزیادبونە

■ نەوژین- شۆخان حەمەساڵەح

**(هۆزان فەریق حسین)، ٢٥ ساڵ، خوێندکاری قۆناغی سێیەمی کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی گەرمیانە، ئەم کچە وەرزشکارە چالاکی بواری وەرزشی گۆرەپان و مەیدانە لەشاری کەلار.**

دەرکەوتن وچالاکی و سەرکەوتنەکانی ئەوی کردۆتە جێ سەرنجی ڕاهێنەران و هاندەرانی بوارەکە، (نەوژین) لە نزیکەوە دواندی و چەند پرسیارێکی ئاراستە کرد:

***سەرەتای هاتنە نێو دونیای وەرزشیت کەی بو؟**

لەو کاتەی کەلەقۆناغی خوێندنی ناوەندی بوم بەهاوکاری بەڕێز (م.سۆران) مامۆستای وەرزش بەشداری چەند چالاکیەکی وەرزشیم کردو ئەوە سەرەتای دەستپێکی ژیانی وەرزشی من بو.

***ئایا بەحەزی خۆت چویتە ناو بواری وەرزشەوە؟ ڕێگریت نەبو؟**

بەڵێ بێگومان بەویست و حەزی خۆم بو کە چومە ناو دونیای وەرزشەوە، وەبێگومان بەپاڵپشتی بەهێزی باوکم و خێزانەکەم و ئەوان نەک ڕێگریان لێنەکردم بەڵکو هاوکارو یارمەتیدەرم بون بۆ هەرچی هەوڵدان و سەرکەوتنی زیاتر. بەڵام بەداخەوە کۆمەڵگە بەچاوێکی نزمەوە لەو کچانە ئەڕوانن کەلە یانەکاندا درێژە بەکاروانی وەرزشی خۆیان دەدەن.

***ئایا جگە لەخێزانەکەت کێی تر پاڵپشتت بوە بۆ وەرزش؟**

بەپێویستی دەزانم لێرەوە زۆر سوپاسی بەڕێزان م.سۆران ودیاری ڕاهێنەر و م.کۆماری سەرۆکی یانەکەم و هاوڕێم بەختیار بکەم کەڕۆڵی گرنگ و بەرچاویان هەبوە لەپێگەیاندنی من وەکو وەرزشکارێکی پیشەگەر.

***ئێستا لەچ یانەیەکی وەرزشی یاری دەکەیت؟**

ئێستا یاریزانی یانەی شێروانەم و لەو یانەیە بەردەوامی بەژیانی وەرزشی خۆم دەدەم.

***ئەو چالاکیانە چی بون کەبەشداریت تێداکردون و چ ئەنجامێکت بەدەستهێناوە؟**

لەقۆناغی ناوەندی بەشداری پێشبڕکێی بازدانم کردوەو لە ئاستی پەروەردەکان پلەی سێیەمم بەدەستهێناوەو لەپاڵەوانێتی گۆڕەپان و مەیدان لەکەرکوک پلەی سێیەمم بەدەستهێنا هەروەها لەچەند پاڵەوانێتی و پێشبڕکێیەکی تردا بەشداریم کردوەو ئەنجامم هەبوە.



***شادترین و خەمگینترین ساتە وەرزشیەکانت چی بون؟**

شادترین کاتی وەرزشیم ئەو کاتە بو کە لەپاڵەوانێتی گۆڕەپان و مەیدانی کەرکوک ئەنجامم بەدەستهێناو ناخۆشترین ساتیشم لە ماوەی ڕابوردودا بو کەپلەی چوارەمم بەدەستهێنا لەپاڵەوانێتیەکدا کەبۆ ساڵیادی کۆچی دوایی سەرۆکی پێشوی گۆڕەپان و مەیدانی کوردستان بو کە لەسلێمانی سازکرابو.

***ئایا بەتێڕوانینی بەڕێزت جیاوازی هەیە لەنێوان گەرمیان و ناوچەکانی تر لەڕوی وەرزشی ئافرەتانەوە بەگشتی؟**

بەڵێ جیاوازی هەیە، بۆ نمونە لەشاری کەلار چەندین کچ هەن کەبەهۆی ڕێگری خێزان و کۆمەڵگەوە ناتوانن بێنە بوارەکەوە، لەشارە گەورەکان کچان زیاتر ئەتوانن بەشداربن و بونی خۆیان نیشان بدەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەرەوپێشچونی باش هاتۆتە کایەوەو ژمارەی کچانی وەرزشکاری دەڤەرەکە ڕو لەزیادبونە.

***ئایا تا چەند ڕاگەیاندن گرنگی بەوەرزش داوە؟ بەتایبەتی بواری گۆرەپان و مەیدان؟**

بەداخەوە گرنگی پێدانی ڕاگەیاندنەکان لەئاستی پێویستدا نیەو ئەمەش خزمەت بەوەرزش ناکات.

***ئایا چ تەمەنێک دادەنێی بۆ وازهێنان لەوەرزش؟**

بڕواناکەم هەرگیز وازبێنم و هیچ تەمەنێکیشم دیاری نەکردوە بۆ وازهێنان.

*** هاندەری چی یانەیەکی لەدەرەوەو ناوەوەی کوردستان؟**

من هاندەری یانەی ڕیاڵ مەدریدم و لەناوخۆش هاندەری یانەی شێروانەم.

***ئاوات و ئامانجت بۆخۆت و یانەکەت چیە؟**

هیودارم بتوانم بەسەرکەوتنەکانم سەری شارەکەم بەرز بکەمەوەو ببمە جێی شانازی خانەوادەکەم، وەهەروەها هیوادارم یانەی شێروانە بگاتە ئاستی یانە باشەکانی کوردستان و عێراق و بتوانێت بەشداری پاڵەوانێتی وەرزشی بکات لەسەر ئاستی عێراق و ئاسیا.

***ئایا تائێستا توشی پێکان بویت لەکاتی یاریکردندا؟**

بەڵێ ساڵی پار لەکاتی ڕاهێنان توشی پێکان بوم.

***پێناسەت چیە بۆ ئەم وشانە:**

*یانەی شێروانە

هیوادارم هەمیشە سەرکەوتوبێت.

*باوک

باوکم هەمو شتێکە

*کەلار

شوێنی لەدایکبونمەو زۆرم خۆشەوی و هیوادارم زیاتر پێش بکەوێت.

# نەوژین هەنگاوێک بۆ بوژانەوەی راگەیاندنی ژنان

■ نەوژین

لەسەردەمێکدا کەرۆژنامەی کاغەزیی زیاتر لە هەمو کەناڵەکانی تری راگەیاندن لە قەیرانی کەمی خوێنەر دایە، دەستبردن بۆ پرۆژەی رۆژنامەیەک کە تایبەتمەند بێت و لەناوچەیەکی وەکو گەرمیاندا بێت کە زیاتر لە هەمو ناوچەکانی تر قەیرانی خوێنەری هەیە، بڕیارێکی قورس و سەرکێشییەکی سەختە، چونکە زۆرینەی پێدراوەکان ئاماژە بە گرانیی گەڕانەوەی وەرگر بۆلای رۆژنامە دەکەن.

کەواتا پەنا بردنە بەر پرۆژەیەکی لەمشێوەیە بۆ؟

ئێمە لە رادیۆی دەنگ لەمیانی شەنوکەوکردنی ئەم پرسەدا لەگەڵ هاورێیانی پشتیوانی پرۆژەکەمان لە سندوقی پاڵپشتی دیموکراسی ئەمریکی (NED)، زیاد لە ئامانج و مەبەستێکمان دانابو کە دەمانەوێت لەمیانی سەرگرتنی ئەم رۆژنامەیەوە بیپێکین. سەرەتاو گرنگترین مەبەست، پەرەدانە بە رۆژنامەوانیی تایبەت بە پرسەکانی ژنان، کە لە گەرمیاندا کەناڵێکی ئەوتۆی راگەیاندن نیە خۆی تەرخانکردبێت بەم پرسە، لەکاتێکدا زیاتر لەهەر ناوچەیەک، گەرمیان پێویستی بە هەوڵی پەرەدان بە راگەیاندنی تایبەتمەند بە پرسەکانی ژنانی هەیە. دەرکردنی رۆژنامەیەکی لەوشێوەیەش، ئەگەرچی کارێکی رەنگە تاڕادەیەک گران و سەخت بێت، بەڵام پێمانوایە زوتر و باشتر دەچێتە ناو کۆمەڵەوەو دەشگاتە زۆر پنت کە رەنگە کەناڵی تری راگەیاندن نەتوانن پێی بگەن.

ئەو شێوازەش بۆ کاری رۆژنامەکە دانراوە، هەمان ئەو شێوازە پیشەییەیە کە لە رادیۆی دەنگدا لەماوەی ٦ساڵی رابردودا پەیڕەومان کردوە، بەوەی رۆژنامەکە بەیەک ماوە لەئاست هەمو لایەنەکان بوەستێت و ئامانجە سەرەکیەکەی لەباسکردنی پرسەکانی ژنان و پەرەدان بە مافەکانی ژنان و رەخساندنی کۆمەڵگایەکی یەکسان لەروی جێندەر و رەگەزەوە، لەهەمو شت لەبەرتر بێت، هەروەک هەوڵێک بێت بۆ پیشاندانی ئەو رۆڵەی ژنانی گەرمیان لە کۆمەڵگەکەیاندا گێڕاویانەو دەیگێڕن و ئەو بەربەست و ئاستەنگیانەی لەبەردەمیاندا قوت دەبنەوە.

ئێمە پرۆژەکەمان دەستپێکرد، بەڵام چەند چاومان لە بەردەوامبونێتی، هێندەی ئەوەو زیاتریش، خەمی ئەوەمانە تاچەند رۆژنامەکە جێگە دەگرێت و چەندێک لە ئامانجە پلان بۆ دانراوەکەی نزیک دەبێتەوە.

ئێمە کە بڕیارمان لە دەرکردنی ئەم رۆژنامەیە داوە، مەبەستمان تەنها ئەوە نیە رۆژنامە دەربکەین، بەڵکو دەمانەوێت دەستپێشخەرییەکی هاوبەشو بەشدار بێت لەبەرەوپێشەوەبردنی دۆزی ژنان لەکوردستان و گەرمیان.

رادیۆی دەنگ، پرۆژەیەکی میدیایی سەربەخۆیە لەناوچەی گەرمیان، لە ٢٠١٠ ەوە بە پەخشی رادیۆیەکی لۆکاڵی دەستی پێکردوەو پاشان وێبسایتێکی هەواڵی لە ٢٠١٦ ەوە کردوەتەوە، لەم میانەشدا چەندین چالاکی رۆشنبیریی و میدیایی و خولی راهێنان و کۆڕ و سیمینار و یەکەی چاودێریی و بەدواداچونی کردوەتەوە.

نەوژین، دواین هەنگاو و پرۆژەی رادیۆکەیە بە ئامانجی برەودان بە کاری میدیایی ژنان.

ئەم ژمارەیەش لەروی دارشتنی رۆژنامەوانیەوە، لەلایەن ئەکادیمیای میدیای ئەڵمانی لەعێراق سەرپەرشتی کراوە.

* سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی (NED) دامەزراوەیەکی ئەمەریکی قازانجنەویستی تایبەتە بە گەشەپێدان و پاڵپشتیکردنی دامەزراوە دیموکراتییەکان لەهەموو جیهاندا، کە لەلایەن کۆنگریسی ئەمەریکییەوە ساڵانە بودجەی تایبەتی بۆدیاریدەکرێت. رۆژنامەی نەوژین یەکێکە لەچالاکیەکانی پرۆژەیەکی رادیۆی دەنگ کە لەلایەن سندوقەکەوە پاڵپشتیی دەکرێت.

ئەم ژمارەیە لەروی رۆژنامەوانیەوە لەلایەن «ئەکادیمیای راگەیاندنی ئەڵمانی MICT» سەرپەرشتی کراوە

med:a academy iraq

ژنانی گەرمیان لە پاڵپشتیەوە بۆ پێشەنگایەتی کردنی ناڕەزایەتیەکان. فۆتۆ: ئاراس محەمەد

# ژن و پیاوێکی کلتور شکێن

■ نەوژین- گوڵباخ حەسەن

**هەتائێستا دانانی کافێ و شوێنی پشودان، وەکو پیشەیەکی تەواو پیاوانە لەکۆمەڵگای ئێمەدا سەیر کراوە، بەڵام ژن و مێردێک لە دەربەندیخان، ئەم تێڕوانین و نەریتە دەگۆڕن و پێکەوە کافێیەک دادەنێن، هەر لەکافێکەشدا، ژنان هاوشانی پیاوان دەتوانن دانیشن و پشو بدەن.**

ئارام و پەرژین، دو هاوسەری خەڵکی دەربەندیخانن، بیرۆکەیەکیان تاقیکردوەتەوە، کەتائێستا کەس دەستی بۆ نەبردوە، ئەویش کردنەوەی کافێیەکی کراوەیە بۆ هەردو رەگەز کە لەلایەن هەردوکیانەوە بەڕێوەدەبرێت. ئەوان رۆژانە لەو کافێیەدا پێشوازی لە میوانەکان دەکەن، بە رویەکی خۆشەوە بەڕێیان دەکەن.

کافێکەی ئەو دو هاوسەرە، کەناوی ”لیسا کافێ“یە، لە قەزای دەربەندیخانە کە یەکەمجارە کارێکی وەهای تێدا دەکرێت. ئاخۆ چۆن پێشوازیی لە بیرۆکەکەیان کراوە؟

ئارام کەتەمەنی ٢٧ ساڵە، وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: هیچ ئیشوکارێک بەبێ کێشەو لەمپەر دروستکردن نابێت، بەڵام ئەوان توانیویانە زاڵ بن بەسەر لەمپەرەکاندا، ئەوەتا ماوەی پێنج مانگە درێژەیان بە پرۆژەکەیان داوەو خۆشحاڵیشە کە ئیشەکەشیان رۆژانە لەپەرەسەندن دایە.

وەک ئارام باسیدەکات، ئەم کارەی ئەوان بەتەنها بزنس و کاسبی نییە، بەقەدەر ئەوەی چاویان لە کافێکەیانە وەکو پرۆژەیەکی رۆشنبیری دەربکەوێت، ئەو دڵخۆشە بەوەی کە لەیەک کاتدا هاوڵاتیان لەهەردو رەگەز دەتوانن سەردانیان بکەن، ئەمەش بوەتە هۆی خولقاندنی کەشێکی هێمن و جیاواز و تایبەت.

پەرژین، هەمان بۆچونی ئارامی هەیە لەوەی کە جگە لەوەی ئەم شوێنکارە بژێوییان دابین دەکات، هاوکات بوەتە ناوەندێکی پشودان و رۆشنبیریی خێزانیی.

زۆرینەی پیاوانی کۆمەڵگای ئێمە کە کاسبی دەکەن، زۆرتر بەلایەنەوە پەسەندە کە هاوسەرەکانیان خۆیان بۆ ماڵ و ژیانی خێزانییان تەرخان بکەن، بەڵام ئارام پێچەوانە بیر دەکاتەوە، ئەو پێی خۆشە کە هاوسەرەکەی رۆڵی خۆی ببینێ لە دەرەوە. هەروەک بونی هاوسەرەکەی لەکافێکەدا وایکردوە کە ژنان زۆرتر سەردانیان بکەن.

کافێکەی ئەم دو هاوسەرە، نەک لەدەربەندیخان، بەڵکو تەنانەت ناوبانگەکەی رۆشتوە بۆ شوێن و شاری دیکەش.

سارا، کچێکی دانیشتوی شاری سلێمانیە، بەمیوانی هاتوەتە دەربەندیخان، وەکخۆی وتی: یەکێک لەئامانجە سەرەکیەکانی سەردانەکەی بۆ دەربەندیخان، بەسەرکردنەوەی ئەم کافێیە بوە، چونکە بەوتەی خۆی یەکەمجارە دەبینێت لە کوردستان دا ژن و مێردێک پێکەوە شوێنێکی لەمشێوەیە گونجاو و خۆش دەکەنەوە.